هەفت دەفتەر هەڵبەس

# وشەێل
# ئەژ هەفت دەلیا
# گوارننەم

ڕێوار ئاودانان

هەفت دەفتەر هەڵبەس

# وشەێل، ئەژ هەفت دەلیا گوارننەم

**ـــ کلمات، از هفت دریا عبورم می‌دهند ـــ**

ڕێوار ئاودانان

چیا

ناسنامەیٚ پرتووک

ناو: وشەیٚل، ئەژ هەفت دەلیا گوارننەم

هەفت دەفتەر هەڵبەس کوردی

بقەش: ڕێوار ئاودانان

وەشنگە: چیا

یەکم چاپ: ۲۷۲۴ کوردی / ۱۴۰۳ هەتاوی

---

مشخصات کتاب

عنوان: کلمات، از هفت دریا عبورم می‌دهند

هفت دفتر شعر دوزبانه‌ی کُردی ـ فارسی

شاعر: ریوار آبدانان

نشر: چیا

چاپ نخست: ۲۷۲۴ کُردی / ۱۴۰۳ خورشیدی

## ( کۆ ١ )

کۆ،

هەیٚ ئەۆ دۆنە ڕیٚخ کوچکڵەسا

ئەڵسەر شۆنەل تەنیای خوەیٚ

نیشتیٚیە.

❖❖

## ( کوه ١ )

کوه،

همان دانەی کوچکِ شن است

روی شانەهای تنهاییِ خودش

نشسته است.

## ( دمایین پاچا )

شەو هەزار و یەکمە

ت، چیرووکەگەت ئەوپەرتخ بردیتە و

وە لەوەیلێگ ک چمانێ هەفت قولف بێکلیل لە لێیان دایتە

لە بان مۆبڵە وەنەوشەگەێ ژوورەگە،

خەو کەفتێیەسە لێت.

بەڵام من

وە قۆڕشکەگەێ خالیی قاوەگەم

ک هیرۆگلیف دۊابینی و پێشزانی لە ویر بردێیە

دنوورڕم و

هۆر لە بانەشەو و شەوەیل داهاتوو دکەم

هۆر لە ئەژدەها هەفتسەرەگەێ تەنیایی

ک هەمۊشە ها خەوەر؛

هۆر لە وەفرە قورسەگەێ بێدەنگی

ئەڵ بان شوونپاگان بۆچگ بەختەوەری

ئوو هۆر لە یە ک، چۆ وە بێ چیرووک ترەکێ

ک دجارە خۆن گەرم دەنگت

دەناو دالّانەگەیْ سەردوسرِ ڕەگەیلم بخەیْدەو ڕێ

م لە شارە ڕەش و تیەریکەگەیْ مردەیل

دژیینید؟!

❖❖

## ( آخرين قصّه )

شبِ هزار و يكم است

تو، قصّه‌ات را به پايان رسانده‌ای و

با لب‌هايي كه انگار هفت قفلِ بی‌كليد بر آن‌ها زده‌ای

روی مُبل بنفشِ اتاق،

خوابت بُرده است.

من اما

به فنجانِ خالیِ قهوه‌ام

كه هيروگليفِ آينده‌بينی و پيشگويي را فراموش كرده است

نگاه می‌كنم و

به فرداشب و شب‌های آينده فكر می‌كنم

به اژدهای هفت‌سرِ تنهايی

كه هميشه بيدار است؛

به برف سنگينِ سكوت

بر روی ردّپاهای كوچكِ خوشبختی

و به اينكه، چگونه بدون قصّه‌ای ديگر

كه بازهم خونِ گرمِ صدايت را

در دهلیز سردِ رگ‌هایم جاری سازد
مرا در شهرِ سیاه و تاریکِ مردگان
زنده نگه خواهی داشت؟!

## ( مینەی )

لە سەرەتا، وشە بۆ
سەرگەردان و هەڵوەدا
وە شوون لێوەگان ت گەردیا!

❖❖

## ( جست‌وجو )

در آغاز، کلمه بود
سرگردان و آواره
به دنبالِ لب‌های تو می‌گشت!

## ( پەژارەم، هەر ئی باڵنە بیچکڵانەیٚ تەڕ و تلیکەسا )

پەژارەم،

هەمیشە نێیەو وە وشە

تا ئەڵ یادگەیٚ ئسپێی کاغەز بنیسنمەیٚ و

دەناو دەفر نامەێک

ڤە ناونشان چاوانێک دە ئەولایٚ دیوارەل بەرز زەمان

بسپارمەیٚ ڤە دەس بایٚ.

پەژارەم،

تاکەگلێک هەر ئی باڵنە بیچکڵانەیٚ تەڕ و تلیکەسا

ک ئەڵ بان شان چەپم غوژ ئڵاتێیە.

نە!... ڤە بەردەفڕە نەڤاێنەیٚ

ڤەفەسیش بنە ئەوٚلا

ک هەرگز ماڵی نێیەو.

بێلە تا لە هەێمەیٚ ناوەێن شریقەیٚ ئەورەل

ئاوازەکەیٚ بخوەنیٚ؛

دمایٚ ڤاران

ئەوەندە دەنوک دەێد ئەڵ زامەکەیٚ سینەم

تا پەنجەرەی سوورێک

چەنە تەز باڵەلێ

وەرەو ئاسمان بێپەرتخ، بچەکێ

ئێنگل...

❖❖

## ( اندوهم، همین پرنده‌ی کوچکِ خیس است )

اندوهم،

همیشه واژه نمی‌شود

تا بر حافظه‌ی سفیدِ کاغذ بنویسم‌اش

و درون پاکت نامه‌ای

به آدرسِ چشم‌هایی در آن‌سوی دیوارهای بلندِ زمان

به دست باد بسپارم‌اش.

اندوهم،

گاهی همین پرنده‌ی کوچکِ خیس است

که روی شانه‌ی چپ‌ام کِز کرده.

نه!... با سنگ‌پرانی فراری‌اش نده

قفس را هم کنار بگذار

که هرگز اهلی نمی‌شود.

بگذار تا در فاصله‌ی میان غرّشِ ابرها

نغمه‌اش را بخواند؛

**پس از باران**

**آن‌قدر نوک می‌زند بر زخمِ سینه‌ام**

**تا پنجره‌ای سُرخ**

**به اندازه‌ی کرختیِ بال‌هایش**

**رو به آسمانِ بی‌انتها، باز شود**

**آنگاه...**

## ( پیانۆژەن )

ژەنیارێ ئژناسم ک

ئژ ئەڤ دمائێڤارەیٚ سەردە ک کووڵاژدم پەژارە

کلکەلێ چزەن

هەر دەسێ ژەیٚ، لە کات پیانۆژەنین

موومدانێکە

ڤەگەرد پەنج مووم ئەڵگریسیایە!

❖❖

## ( پیانیست )

نوازنده‌ای را می‌شناسم که

از آن شامگاه سردی که عقربِ اندوه

انگشتانش را گزید

هر دست‌اش، به هنگام نواختنِ پیانو

شمعدانی‌ست

با پنج شمعِ برافروخته!

## ( دۆڵفینەیل کەو )

گیژاوەیل دێوئاسایْ گومان و

باسریشکەیل سامناک وازوەرەن

دترسنیْ

داجمیان کەشتییە شکۆمەندەگەیْ پایلد

ژە کەنداو دوورەپەرێزی؛

چۆن ک بایەوانە سوورەگەیْ دڵت

لە بان ئەو هەڵدریاگە

ئوو چاوانت لانمایگە

ک دە لێڵترین ڕووژەیل تەمتەمەلۆلان و

بێ‌ئەسارەترین شەوەیلیش

لێوارەگان "وڵات ئەوین" گوم نیەکەیْ.

هنایْ ک ئەوبان کەشتییەگەیْ چەرمگت،

بتەو وسیدن و

ئاڵایْ لێوەخەنەت

ئەڵ دیلەکەگەیْ هەرەبەرز هیوا دشەکنی

جەهان، قەشەنگتر ئەژ هەرڤارە

**شەپووڵەیل بەرز دژواری و ڕەنج**

**لە وەردەمت سەر دچەمنن و**

**گاشەبەردەیل قوت و قوژمەیٚ مەترسی**

**کز و تووزیایٚە، ئەژ تاوت دڤان.**

**ئەسپەیل دەریایی پەژارە**

**وە یەیٚ ئاماژەت دەسەڵێن دبن و**

**دۆڵفینە کەوەگان شایی**

**لە دەورگردت دەس دکەنە هەڵبەزدابەز.**

**بیٚ چرچ و سزرگە و دڵەکوتە**

**ئوو وە دڵنیاییێگ ڕووناکتر ژە تیشک خوەر**

**ڕێڤار و هاودەم هەرایٚهەریی تونم**

**لە شازەریا نەناسیارەگەیٚ ژیان؛**

**چۆن ک کەشتیوانەگەیٚ وریا، تونی و**

**فەرمان وەرەو هەرلا بلڕنی**

**دۆرترین پەرتخ و ئامانجەیلیش**

**فەرە نزیکن.**

❖❖

## ( دلفین‌های آبی )

گرداب‌های غول‌آسای شکّ و
توفان‌های هول‌انگیزِ اوهام را
به هراس می‌افکند
عزیمتِ کشتیِ باشکوهِ پاهایت
از خلیجِ انزوا؛
چرا که بادبانِ سرخِ قلب‌ات
بر فراز آن افراشته است
و چشمانت جهت‌نمایی‌ست
که در تیره‌ترین روزهای مه‌آلود و
بی‌ستاره‌ترین شب‌ها نیز
کرانه‌های «سرزمینِ عشق» را گم نمی‌کند.
آنگاه که بر عرشه‌ی کشتیِ سپیدت،
استوار می‌ایستی
و پرچمِ لبخندت را
بر بلندترین دیرکِ امید، به اهتزاز درمی‌آوری
جهان، زیباتر از همیشه است
موج‌های بلندِ دشواری و رنج
در برابرت سر خم می‌کنند
و صخره‌های گستاخ و مغرورِ خطر
زبونانه و مغلوب، از مقابل‌ات می‌گریزند.
اسب‌های دریاییِ اندوه

با یک اشاره‌ات رام می‌شوند

و دلفین‌های آبیِ شادی

در پیرامون‌ات به جست‌وخیز درمی‌آیند.

بدون بیم و لرز و دلشوره

و با یقینی روشن‌تر از شعاعِ آفتاب

مسافر و همدمِ همیشگیِ توأم

در اقیانوسِ ناشناخته‌ی زندگانی؛

چرا که ناخدای هشیار، تویی

و سُکّان را به هر طرف بچرخانی

دورترین مقصدها نیز

بسیار نزدیک‌اند.

## ( هەنێ "ئاهـ" ڤەکرە کەرێ )

مانگ، لەوڤەبار و سەرکزە

کلکەل سەرد و سڕێ

ئاماژە ڤە پەل هشک هەر دارێ کەرن،

بێجەژ بڕێ چکڕ "ئاهـ" و

توڕ پا باێ

هۆچ نییە.

❖❖

## ( وقتی «آه» جوانه می‌زند )

ماه، غمگین و محزون است

انگشتانِ کرخت و سردش

به شاخه‌ی خشکیده‌ی هر درختی اشاره می‌کنند،

جز شماری جوانه‌ی «آه» و

جاپای باد

چیزی نیست.

# ( وەردەنگ نەناسیار )

ئێرە، ڕووژهەڵات ناڤینە.

گەرەک نییە ڤە کڕەیل دومایٚ یە هۆر بکەی.

هەمیشە،

زامیٚ ئەژ هووز شمشێر

یا گولەیٚ ڤل‌بییەیٚ ئەژ هووز تفەنگ

ئەڵ گرد ئەوەیٚ ک لار و لەش سەرسڕمەنە و

ڤیر پڕ ئاژاوەت

دە ژیانەگەیٚ کولٚت نیسەنێیە

خاڵ کووتای دنیٚ

گورجانەتر ئەژ ئەوەیٚ ک تەنانەت خوەدیش بزانی

دە لاپەڕەیل دیرووک ڕەژیایٚ وە

خۆن و پەژارە و ئاگر وڵاتەگەت

چە نۆسایدە؛

ئوو تەنانەت وەرژە یە ک وەردەنگێگ خاوارە

بخوەنێگەت

وەردەنگێگ ک ناو "ڕووژهەڵات ناڤین"

ئەق، خەێدە ویر مژەیٚ نەفت

وە ویر ئایەیل خوا (نمەک)

واورێز هەگ وە قورٛگ زامدار خاک خوەنریەن.

ئێرە، ڕووژهەڵات ناڤینە.

وە کرٛەیل دومایٚ یە هۊر مەکە.

هەمۆشە، گورٛەیٚ بەرز یەیٚ شمشێر یا یەیٚ گولە

ها وە رٛێیا...

❖❖

## ( مخاطب ناشناس )

اینجا، خاورمیانه است.

نیازی نیست به سطرهای بَعدی فکر کنی.

همیشه،

زخمی از قبیله‌ی شمشیر

یا گلوله‌ای سرگردان از قبیله‌ی تفنگ

بر همه‌ی آنچه جسم و تنِ حیرت‌زده و

ذهنِ پُر آشوب‌ات

در زندگیِ کوتاه‌ات نوشته است

نقطه‌ی پایان می‌نهد

سریع‌تر از آنچه که حتی خودت هم بدانی

بر صفحات تاریخِ رنگ‌آمیزی‌شده با

**خون و اندوه و آتشِ سرزمین‌ات**

**چه نوشته‌ای؛**

**و حتی پیش از آنکه مخاطبی ناشناس**

**تو را بخواند**

**مخاطبی که نامِ «خاورمیانه»**

**او را به یاد طعمِ نفت می‌اندازد**

**به یاد آیه‌های نمک**

**خاصه هنگامی که با گلویِ مجروحِ خاک تلاوت می‌شوند.**

**اینجا، خاورمیانه است.**

**به سطرهای بَعدی فکر نکن.**

**همیشه، نعره‌ی بلند یک شمشیر یا یک گلوله**

**در راه است...**

## ( مەڵوەن شلێرەل و هەنار )

ئەژ ڤڵاتەکەم پرسیم:

"ژە چەن دڵووپە ئەسر، شلێرەێک دێیایۚ ڤەدی؟

ژە چەن دڵووپە خین، هەنارێک؟"

هناس سەردیۚ ئەڵکێشیا و

یەیۚ چیەمێ پڕ ئەژ خین بی

یەیۚ چیەمێ پڕ ئەژ ئەسر.

❖❖

## ( سرزمینِ لالەهای واژگون و انار )

از میهنم پرسیدم:

«از چند قطره اشک، یک لالەی واژگون زاده می‌شود؟

از چند قطره خون، اناری؟»

آهِ سردی کشید و

یک چشمِ او پُر از خون شد

یک چشم، پُر از اشک.

## ( سێسەد ملیۆن ساڵ تیشکی )

نە! هەڵە مەکە

ئێمە هەمیشە سێ کەسێمن: "من، تۆ"

ئیشی ئەنی کەس سێیم کێیە؟!

سێیمین کەس، بێهنۆکەکەی ناوهەێنمانە

ـ نیشان ئمپراتووریی "مەودا" ـ

ک چەشن ئاهێکە

چەنە سێسەد ملیۆن ساڵ تیشکی

بڵێن و درێژەدار....

❖❖

## ( سیصد میلیون سالِ نوری )

نه! اشتباه نکن

ما همیشه سه نفریم: «من، تو»

می‌گویی پس نفرِ سوم کیست؟!

سومین نفر، ویرگولِ میان ماست

ـ نشانِ امپراطوریِ «فاصله» ـ

که شبیه یک آه است

به اندازه‌ی سیصد میلیون سالِ نوری

بلند و کشدار...

## ( کارسات )

گوڵێ دە ژێر کەوشەلەت پلیشخەنی

شوونپالت ئەژ بوو ئەسر، خینالینن!

❖❖

## ( فاجعە )

گُلی را زیر کفش‌هایت پَرپَر نمودی

ردّپاهایت از بوی اشک، خونین‌اند!

## ( گڕان گرتمە، وەکوو قەقنەسێگ )

زامەگەێ دڵم

وە لێو خۆنین

خواێ ئرمێسکەیلەد

ماچ کردێیە.

ئەسە، وە پێم نەوش:

"ت واتاێ ئاگر نمەزانی."

❖❖

## ( آتش گرفته‌ام، مانند یک ققنوس )

جراحتِ قلب‌ام

با لبِ خونین

بر نمکِ اشک‌هایت

بوسه زده.

از این‌رو، به من نگو:

«تو معنای آتش را نمی‌دانی.»

## ( گووڕیان )

وەرجله ت

ئاسمانیش

پانایی فرەێگ نێیاشت ــ

هاتیدن و

"بێپەرتەخی" دەس وە پێ کردا!

❖❖

## ( دگرگونی )

پیش از تو

آسمان هم

وسعت چندانی نداشت ـ

آمدی و

«بی‌نهایت» آغاز شد!

## ( چی گوڵ )

ـ چ قشەیێ جوور گوڵ، گوشکێ؟

ـ ناوت!

❖❖

## ( همچو گُل )

ـ کدامین واژه همچون گُل، می‌شکوفد؟

ـ نام‌ات!

## ( لەش گڵەشکاو ئاو )

**برِێگ لە زامەیل**

**لەوایێ گوارِیین بەڵەم ژە رِووبارن؛**

**لەش ئاو**

**تا بن هەست و سخانەیل چەرمگێ**

**گڵەشکاو دبێ، بەڵام**

**خەڵک تا وە چەو خوەیان، خۊن نەوینن**

**باورِ ناکەن!**

❖❖

## ( پیکر چاک‌چاکِ آب )

**برخی جراحت‌ها**

**مثل گذشتنِ زورق از رودخانه‌اند؛**

**پیکرِ آب**

**تا عمقِ استخوان‌های سپیدش**

**پاره پاره می‌شود، اما**

**مردم تا با چشم‌های خودشان، خون نبینند**

**باور نمی‌کنند!**

## ( دمایین دەسنڤیس نەژناسێک )

ئاو

ئەژ یەێجا مەنن، شەکەت دووێ...

دڤم ڤە ماسی

تا ڤە ڤشەل خین خوەم،

پاشخوانێک ئڵارم

ئەڵ ئی هەمگە پرسنشۆنە

ک قولاپەل سەرد و سڕ

هەر شەڤ و هەر ڕوو

دە ڤەراوەر دەم نقیاێە ئەژ بێدەنگییم

دوڕ کەرن:

؟

؟

؟

❖❖

## ( آخرین دست‌نوشته‌ی یک ناشناس )

آب

خسته می‌شود از یکجا ماندن...

ماهی می‌شوم

تا با کلماتِ خونِ خود،

پاسخی بالا بیاورم

بر این‌همه علامتِ سؤال

که قلّاب‌های سرد و بی‌روح

هر شب و هر روز

در مقابل دهانِ پُرشده از سکوت‌ام

آویزان می‌کنند:

؟

؟

؟

## ( ئەڤر بلوورژەن )

ڕووژەل ڤارانی...

بلوورێکە ڤە دەس ئەڤرەل

مەرزیب ئەنجووڵەکە

❖❖

## ( ابر نی‌نواز )

روزهای بارانی...

نی‌لبکی‌ست به دست ابرها

ناودانِ کلبه‌ی کوچک

## ( سوورترین )

وێیەریان بووکەسوورەیگ

ژە ئاسمان سەرئێوارە ــ

یە سوورترین ڕێگەس ک تا ئێرنگە

وە چەو دیمە.

❖❖

## ( سُرخترین )

عبور یک سینه‌سرخ

از آسمانِ عصرگاهی ــ

این سُرخترین راهی‌ست که تاکنون

به چشم دیده‌ام.

## ( ڤریسکەیٚ پرسیارێک )

ڤە خوەم ئەشم:

"چەن دەریا ها ناون من و ئەڤی؟

چەن کۆ؟

چەن دارسۆ؟

چەن سەرداوە؟"

گەرەک ئەژ قازقوڵنگەل بپرسم.

❖❖

## ( دردِ ناگهانیِ یک پرسش )

با خودم می‌گویم:

«چند دریا میانِ من و اوست؟

چند کوه؟

چند جنگل؟

چند پاییز؟»

باید از دُرناهای مهاجر بپُرسم.

( بڵاچە )

لەناو چاو ت

ئەورێگ بڵاچان...

ژوورەگە،

پڕ بۆ لە جیکەجیک مەلیچگ و

دەنگ کەمانچەگەیٚ واران!

❖❖

( آذرخش )

در چشمِ تو

ابری صاعقه زد...

اتاق،

پُر شد از جیک‌جیکِ گنجشک و

نوایِ کمانچه‌ی باران!

( خەو )

دە یەک دەنکە ڕێخ، چەن چیا خەفتگە؟

❖❖

( خواب )

در یک دانه‌ی شن، چند کوه خُفته است؟

## ( بگاره )

ده لێڤار ڤەزەنێ...

بێجەژ خەنەخەن و گرێڤەل ئاسکین

نییە دەنگێ

❖❖

## ( گُذر )

بر لبەی پرتگاهی ژرف...

جز خندەها و گریەهای روزگارانِ رفته

نیست صدایی

## ( ئرمس و دەریا )

چوورِێگ ئرمس، چەن دەریاس؟

❖❖

## ( اشک و دریا )

یک چکّە اشک، چند دریاست؟

## ( گازڕان )

گازڕان خودایل و
مەتەشخەڵەیلە: بارکوو! ـ
یە هەر ئەو گوورانیی کوانەس
ک وە "شکانن" دەس پیێ ئەکا.

❖❖

## ( کابوس )

کابوسِ خدایان و
بت‌هاست: پُتک! ـ
این همان ترانه‌ی کهن است
که با «شکستن» آغاز می‌شود.

## ( سەردەوا )

ت دڵتەنگەو دبی
"ئاهـ" ئەڵکیشی...
لەیۆوا لە ناکاوا
دبێگە "سەردەوا"

❖❖

## ( پاییز )

تو دلت می‌گیرد

«آه» می‌کشی...

این‌گونه ناگهان

«پاییز» می‌شود

## ( دمایێ ئەڤگرتن ڤاران دپرسم )

ئەڕەیێ چە پەژارەیێ دارسان، زەرد و نارنجییە؟

ژچە بسکەیێ گڵاڵ، ناوێ قەڵوەزە؟

ئەڕاچە هەر کانیی ترنگەکەر، وەک چاو داڵکەیلە؟

ڤەرچە دەمەخەنەل ئاسکین، دبن ڤە ئەسرین؟

ئڕاچە تەمەلۆل، پەلەوەرێگ باڵچەرمێیە نە وەنەوش؟

ژچە هاژەیێ تاف، پڕ ئەژ بڵێزەل کەوە؟

ئەڕاچە دۆاڕووژ، چەشن دڵووپ لەرزووکێگە؟

ڤەرچە ژین، تەنیا ڤە بارکووڵەیێ ئەڤین، ئەڵکێشێ ئەڵ بنار؟

❖❖

## ( بعد از بندآمدنِ باران می‌پرسم )

چرا اندوهِ جنگل، زرد و نارنجی‌ست؟

چرا لبخندِ رود، نامش موج است؟

چرا هر چشمه‌ی زُلال، شبیه چشم مادران است؟

چرا خنده‌های گذشته‌های دور، بدل به اشک می‌شوند؟

چرا مِه، پرنده‌ای سفیدبال است نه بنفش؟

چرا صدای آبشار، پُر از شعله‌های آبی‌ست؟

چرا آینده، شبیه قطره‌ای لرزان است؟

چرا زندگی، تنها با کوله‌بارِ عشق، از سربالایی صعود می‌کند؟

## ( پژمەی گوڵە مێخەک )

هەڵفڕین شەوانەی پەپییەل،

چمۆنێ گوڵە مێخەکێ پژمەن

دە ڕووناییی مانگەشەو

❖❖

## ( عطسه‌ی گُل میخک )

پرواز شب‌هنگامِ پروانه‌ها،

گُل میخکی عطسه زد گویا

در روشناییِ مهتاب

## ( وڵات ئازاد )

چەنە هەرمانێگ

وەگەرد ت ئاواز خوەنم

وەگەرد ت ئرمێس ڕشنم

وەگەرد ت زەردەخەنە کەم و

لە مەرگیش ڕخم نیەچوو؛

هەریە بەسە ک چەن هەناسەێگ

ت بۆدە وڵات ئازادم.

❖❖

## ( میهنِ آزاد )

به اندازه‌ی یک ابدیّت

با تو آواز خواهم خواند

با تو اشک خواهم ریخت

با تو لبخند خواهم زد

و هراسی از مرگ نیز نخواهم داشت؛

همین بس که به‌قدر یک نَفَس

میهنِ آزادِ من گردی.

## ( چمەێتک )

ئەر چمەێتک زامەێلمان نەۋیاتا،

ڤەچە دتۆنسێمن یەیٚ گلیٚ تر ڤەدی بێیایٚمن

ئەژ ناوڕاس تەریکییەکەیٚ دەرینمان؟

❖❖

## ( مشعل )

مشعلِ زخم‌هایمان اگر نبود،

چگونه یک بار دگر می‌توانستیم زاده شویم

از دلِ تاریکیِ درون‌مان؟

## ( درەخت )

دڵ ت

پاساریی بۆچکەڵەێگە؛

سەێر نییە ک تەنانەت تەڵەسانەیلیش

ئاوەختێیان "درەختبۆن"ـە لە هناز هەڵفڕینت.

❖❖

## ( درخت )

قلبِ تو

گنجشکِ کوچکی‌ست؛

عجیب نیست که حتی صخره‌ها نیز

آرزویشان «درخت‌بودن» است در مسیر پروازت.

## ( پرتووکەیل نەنیسەنە )

هێمانیش

"ئازادی"، ئەلفوبێی کرەخەێکە و

ئێمە، پرتووکەیل نەنیسەنەێک...

ئەڵ پەڕەێل پەتیی یەکترەکی

دەس سایمن و

کلکەێلمان ئەژ ڤەشت داخ و ژان کۆنەێک

ڤە یەێگلی گرە گرن.

❖❖

## ( کتاب‌های نانوشته )

هنوز هم
«آزادی»، الفبایی انحصاری و ممنوعه است
و ما، کتاب‌هایی نانوشته...
بر صفحاتِ خالیِ یکدیگر
دست می‌کشیم و
انگشتان‌مان از شدتِ درد و حسرتی قدیمی
به یکباره می‌سوزند.

## ( کۆ ٢ )

کۆ،
هیردەبەردێکە
کردێیە ئەوگەر تەنیای خوەیۆ!

❖❖

## ( کوه ٢ )

کوه،
سنگریزه‌ای‌ست
از تنه‌ی تنهاییِ خود بالا رفته!

## ( پەپوولە )

لەسەر گوڵەگان باخ

شەونم نیشتگە؛

لەسەر دەنگ ت

پەپوولەیگ!

❖❖

## ( پروانه )

بر گُل‌های باغ

شبنم نشسته است؛

بر صدایِ تو

پروانه‌ای!

## ( ناسوور )

زام ناسوورێکە، دە قەیٚ دیڤار

گزیٚ ئەڤبردێیە ئەڵ ئاسووەل دەسمەڕەس:

پەنجرەکە!

❖❖

( لاعلاج )

زخمِ لاعلاجی‌ست، بر دیوار

خیره مانده به افق‌های دور از دست:

پنجره!

## ( ئەیٚ فریٚشتەکەیٚ مەخمین! )

هەیٚک لچ قولٚ دی

گولٚیٚ ئەژ گولٚەل بهیٚشت پژلٚمیٚ.

هەیٚک ئەسرین ڕژنی

چەمیٚ ئەژ چەمەل بهیٚشت هشک کەریٚ.

ڤەگەرد هەر ڤرەنسکت

داریٚ ئەژ باخەل بهیٚشتیش ئشکیٚ.

هەیٚک "کووف" ئەلٚکیٚشی...

نە!

کووف ئەلٚسەر کووف نەکیٚش!

ئی دووزەخ گڕەگرتە، دەمەنن نەیٚخوازیٚ.

❖❖

## ( ای فرشته‌ی غمگین! )

بغض که می‌کنی
گُلی از گُل‌های بهشت می‌پژمرَد.
اشک که می‌ریزی
رودی از رودهای بهشت می‌خشکد.
با هر هق‌هق‌ات
درختی از باغ‌های بهشت هم می‌شکند.
«آه» که می‌کشی...
نه!
پیاپی آه نکش!
این جهنّمِ سوزان، دمیدن نمی‌خواهد.

## ( واژا )

پاش واران
سەنگاوێک
دە بن دەروەنێ هزار گەزی
پەڵە هەور چەرمگێ ک تا مەولەق چییە
واژا دکەێ ــ

منیش ڤه ژێر لێڤ

ناو ت واژا دکەم

ژه بن دەروەنەکەیٚ تەنیایی.

❖❖

## ( تکرار )

پس از باران

آبچالی سنگی

در ته درّه‌ای بسیار ژرف

لکّه ابر سفیدی را که تا اوجِ آسمان رفته

تکرار می‌کند ـ

من نیز زیر لب

نامِ تو را تکرار می‌کنم

از عمقِ درّه‌ی تنهایی.

## ( سزرگە )

هۆچ سازێ

ئشتە خەمبارانە نەیۆژەنرێ:

دە کشماتیی دماێ بمقاران

ڤەرنیسکەێ دتیلکێ

❖❖

## ( لرزه‌ای بر ژرفای جان )

هیچ سازی

این‌گونه غم‌انگیز نواخته نمی‌شود:

در سکوتِ محضِ پس از بمباران

هق‌هقِ گریه‌ی دخترکی

## ( نزارە )

سەیۆل جاکەێ چوولێ کەرم و

هناسەێ سەردێ ئەڵکێشم...

یاسەمینێ دناو گوڵدانەکە پلمژگێ!

❖❖

## ( يادِ حزن‌انگيز )

به جايِ خالى او نگاه مى‌كنم و

آهِ سردى مى‌كشم...

ياسمنى در گُلدان مى‌پژمرد!

## ( چه‌پكه‌گوڵ بيره‌وه‌رى )

چمانێ سه‌د ساڵ وێيه‌رد

ئه‌مانگ له‌ هه‌ر كوڵه‌سۆك باخه‌گه

له‌تێگ ژه‌ ڕه‌نگينييه‌گه‌ت وه‌ جێ ماگه‌ و

قسيه‌ كه‌ێد ــ

له‌ناو گوڵه‌ مێخه‌كه‌گان،

بوو خوه‌شد.

❖❖

( دسته‌گُل خاطره )

گویی که صد سال گذشت

ولی در هر گوشه‌ی خلوتِ باغ

پاره‌ای از زیبایی‌ات جا مانده است و

سُخن می‌گوید ـ

در لابه‌لای گُل‌های میخک،

عطرت.

( چەرمێ )

بێدەنگی

کەمووتەر چەرمگێکە تاکەگلێ؛

نیشتێیە ئەڵسەر بەرف

❖❖

( سفید )

سکوت

گاهی کبوتری سفید است؛

نشسته بر روی برف

## ( ڕەش )

بێدەنگی

گلگلێکیش ڕەشەداڵێکە؛

ئەڵسەر کۆ۔ تلێک ڕەش نیشتێیە

❖❖

## ( سیاه )

سکوت

گهگاهی هم کرکسی سیاه است؛

نشسته روی صخره‌ای سیاه

## ( فێر )

ساڵانێگ

لە شوون قوڕگ ت گەردییە

وشەیٚ پرچچەرمێی بریندارێگ

ک دی دە هوٚچ جامەکێ

خوەیٚ وە هوٚرەو نیەتیەرێ.

❖❖

## ( جستجو ـ تماشا )

سال‌ها

در جستجوی حنجره‌ی تو بوده است

واژه‌ی گیسوسفیدِ مجروحی

که دیگر در هیچ آینه‌ای

خودش را به خاطر نمی‌آورد.

## ( داخ )

گوڵاڵەسوورەیۆ سزیاگ؛

کڵاو کڵاو وەفریش بوواریێد

شاراوە نیەمینید

❖❖

## ( داغ )

شقایقِ سوخته؛

برف روی برف هم ببارد

پنهان نمی‌مانی

## ( کەسمەزانێک دەسەدژ )

خەنجەرێک، دەناو دڵێ

نارینەێ خیناولینێک، لەسەر لەڤەیلێ

تڵەسان کەڵنێک، ڤە بان شانێ

ئەمانگ هاڵێ هەێ

ڤە پایل پفڵەکداێە و زامدار خوەێ

ڤەرەڤ چکەڵێ و سەرئاسوو دچوو

ڤەرەڤ ئەڤ گوڵە شلێرە

دە ناو وەفرەیل ــ

ئەرێ! ئەڤین ئەیچە چشتێکە.

❖❖

## ( یک راز سربەمُهر )

خنجری، در قلبش

آوازی خونآلود، بر لبانش

تختەسنگی سترگ، بر دوشش

اما هنوز هم

با پاهای تاولزده و مجروحِ خویش

رو به بلندا و قلّه میرود

رو به آن لالەی واژگون

در میان برف‌ها ــ

آری! عشق چنین چیزی است.

## ( کەڵۆوڵی )

چەنێ چارەڕەش و بەدرەژەنن!

ئەڤ وشەلە ک هیچکات

نێیانە خەو هەڵڤەس.

❖❖

## ( تیره‌روزی )

چقدر سیه‌روز و بداقبال‌اند!

آن کلماتی که هیچگاه

به خوابِ شعر نمی‌آیند.

## ( دڵەڕپە )

دڵۆوپێک ئاونگم

دنگڵاوێز

ئەژ پەڕەیٚ گوڵێ ـ

لرەیٚ باڵەلت

کلیل قوفڵەکەیٚ ئی بەرزەکەسا

ئەیٚ پەپییەکەیٚ سەرمەس!

❖❖

## ( تشویش )

قطره‌ای شبنم‌ام

آویزان

از برگ گُلی ـ

لرزش بال‌های تو

کلیدِ قفلِ این برزخ است

ای پروانه‌ی سرمست!

## ( درِک )

ـ چه قوومیایە؟

ـ جەهان بریندارە؛ درِکێ چییە دە پایێ زارِووێ.

❖❖

## ( خار )

ـ چه رخ داده؟

ـ جهان زخمی‌ست؛ خاری به پای کودکی فرو رفته.

## ( دالِّتە )

لەناو ئاخلِّەێ سەرما و کرِێوە

تەنیاییەگەم، گەوەزنێگ بریندارە ــ

دارسان و دالِّتەم بە!

❖❖

## ( پناه )

در چنبره‌ی کولاک و سرما

تنهایی‌ام، گوزنی زخمی‌ست ــ

جنگل‌ام باش و پناهم!

## ( کەشتیی شکیاگ )

ـ ناوت چوەس؟

ـ لە شازەریاێگ ک تنی، "چکڵچووێگ وێڵ"!

❖❖

## ( کشتیِ شکسته )

ـ نامات چیست؟

ـ در اقیانوسی که تویی، «تکّه‌چوبی سرگردان»!

## ( قەفەس چووڵ )

ڤە بێ پەلەڤەریش

قەفەس، هەر ئەڤەسەو ک بی:

لەتێ ئەژ ئی دونیا

ک هەێتاهەێ

ئاخین و داخینە ئاوازەکەێ.

❖❖

## ( قفس خالی )

بدون پرنده هم

قفس، همانی‌ست که بود:

تکّه‌ای از این دنیا

که تا ابد

حسرت‌آمیز و غم‌آلود است آوازش.

## ( ئەژ م ڤێنا... )

هەر ساگەیٚ ک

ئەڵ ئەڤ تیلمەڕێی دیرە دکەفیٚ

ڤە خوەم ئەشم: "ئەڤییە!"

هەرچەن ساگەیٚ کلٚەڤەنیٚ بوو.

❖❖

## ( به گمانم... )

هر سایه‌ای که

بر آن باریکه‌راهِ دور می‌افتد

با خودم می‌گویم: «اوست!»

اگرچه سایه‌ی یک درخت پسته‌ی کوهی باشد.

## ( ژین تاڵ )

دریژەیێ کووریی دیڤارەلە

ئەڤ دەرڤەچە ک ڤەرەڤ ناتنت

دچەکێ!

❖❖

## ( تلخکام )

دنبالەی کورِی دیوارهاست

آن پنجرەای کە رو بە نیامدن‌ات

باز می‌شود!

## ( دلەڕکە )

ڤەر هەر جایێ ک دچم و

نەیڤینمەت

دەس ڤە هەر شوون لووریێ دسام و

نییەسەت،

شوونەوارێک ئەژ ئووره

ئەڵ ڕیی نەخشەیێ زەمین نەیمینێ.

کەم مەنێیە ک ئی جەهانە

یەورەکی ئەژناو بچوو

ئەرێ هاینە کوورە دەێ؟!

❖❖

## ( اضطراب )

به هر کجا که می‌روم و

نمی‌یابمات

به هر جا و مکانی دست می‌کشم و

نیستی،

اثری از آنجا

بر روی نقشه‌ی زمین باقی نمی‌ماند.

اندکی مانده که این جهان

یکسره نیست شود

پس کجایی؟!

## ( شەڤ نزارە )

شەڤگار،

دەناو ڕەگەلم ڕێ کەری و

تورٍ پالێ ک ئەڤدماێ خوەت هێلی ڤە جا

چمەێتەل پەژارەن

ک تا ئەڤلاێ نادیاری، درێژە دێرن و

ڤە هۆچ ڕهێڵێ کوورەڤ نێیەون.

شەڤگارە،

ڤە تیرفرٍنگ ڤاران ئەڵ پەنجرەکە

ئەژ خەو ئەڵسم و

دەناو ئاوێنە سەێل خوەم کەرم:

هەێگوا بەرد گرٍەگرتەێکم

ک ئەژناو دەم ئەفتاو

کەفتمە.

❖❖

## ( خیال شبانه )

شب‌هنگام،

درون رگ‌هایم راه می‌روی

و ردّپاهایی که پشت سر خودت جا می‌گذاری

مشعل‌های اندوه‌اند

که تا آن‌سوی ناپیدایی، ادامه دارند و

با هیچ رگباری خاموش نمی‌شوند.

سپیده‌دم،

با تلنگرِ باران بر پنجره

بیدار می‌شوم و

خودم را در آینه نگاه می‌کنم:

انگار سنگی شعله‌ورم

که از دهانِ آفتاب

افتاده‌ام.

## ( دارسان سەوز )

ئەی هەورە بەرزەگەیْ ئاسمانم!

ئەڵسەر هەرکام ژە هۆرمانەیلم

ک نەیْتکی،

دبیْ وە سەوڵ زەردیْگ

کلکنیشان فەراموشی.

❖❖

## ( جنگل سبز )

ای ابر بلندِ آسمانم!

بر روی هرکدام از خاطراتم

نمی‌چکی،

سروِ زردی می‌شود

انگشت‌نمایِ فراموشی.

## ( سیزیفئاسا )

هەر پەڕێک،

ژانێکە

شکەنجەیێکە

زامێکە ئەڵ

لەشەکەیٚ کز و لەڕ ئەڤ باڵنە ک

فڕین ئژەیٚ دزینە.

❖❖

## ( سیزیفوار )

هر پَر،

رنجی‌ست

شکنجه‌ای‌ست

جراحتی‌ست بَر

تنِ نحیف و بی‌رمقِ آن پرنده‌ای که

پرواز را از او دزیده‌اند.

## ( بنجگ سوورەگوڵ )

زەردەخەنەیگ بکە...

مەگەر ژە پشکڤین بنجگ سوورەگوڵێگ

لەناو وەفرا،

چشتێگ قەشەنگ‌تر هەس!

❖❖

## ( بوتەی گُل‌سرخ )

لبخند بزن...

مگر از شکُفتن بوتەای گُل‌سرخ

در میان برف،

چیز زیباتری هست!

## ( ڤەداخەڤە )

باێەوانەلە

ڤەرەڤ تۆ ئەڵدامە ـــ

داخم دژەباێی!

❖❖

## ( افسوس )

بادبان‌ها را

رو به تو افراشته‌ام ــ

دردا که بادِ مخالفی!

## ( زەرد )

دارسان‌تر ئەژ کراسەکەیْ شینت

دارسانیْ نییە.

دەلیاتر ئەژ کراسەکەیْ کەوت

دەلیایْ نییە.

زەرد دە ڤەر نەکە!

دڵ سەرداوە خسی ڤە ڕکڕەک.

❖❖

## ( زرد )

جنگل‌تر از پیراهنِ سبزت

جنگلی نیست.

دریاتر از پیراهنِ آبی‌ات

دریایی نیست.

زرد نپوش!

قلبِ پاییز را به لرزه می‌اندازی.

## ( سەد ساڵ تەنیایی )

دۆەتڵە دتووریٚ...

یەمە هەر تیکتاک کاتژمار، ئەڕا وەیلکانەگەیٚ

سەد ساڵ تەنیایی

❖❖

( صد سال تنهایی )

دخترک قهر می‌کند...

حالا هر تیک‌تیکِ ساعت، برای عروسک‌اش

صد سال تنهایی

( گوڕاگوڕ )

بێ‌دەنگی، زیڕزیڕنەک پیرێکە

ئەژ واژاکردن تەنیا چیرووکەکەیٚ

هەرگز شەکەت نێیەو

❖❖

( پیاپی )

سکوت، زنجره‌ای پیر است

از تکرارکردنِ تنها قصّه‌ی خود

خسته نمی‌شود هرگز

## ( سەرت سڕ نەمینێ )

ئەگەر دەسەیلت

دە سەردترین ڕووژ بێخوەر

لەناکاو گەرمەو بین

سەرت سڕ نەمینێ؛

بزان ژبن دە ئەولاێ جەهان

کەسێک وە یاێت

دجارە "ئاهـ"ـێک ئەڵکێشیاێە.

❖❖

## ( حیرت نکن )

اگر دست‌هایت

در سردترین روزِ بی‌آفتاب

ناگهان گرم شدند

حیرت نکن؛

بدان حتماً در آن‌سویِ جهان

کسی به یادت

دوباره «آه»ی کشیده است.

## ( گوڵاڵەسوورە )

کلگەیلت، گڵاڵەیل خۆرەتاون

وەرەو هەرلا ئاماژە بکەی

گوڵاڵەسوورەیٚ ئاگرینێک وەدی تێیایٚ!

❖❖

## ( شقایقِ سرخ )

انگشتانت، رودخانه‌های آفتاب‌اند

رو به هر طرف اشاره‌ای کنی

شقایقِ سرخِ آتشینی متولد می‌شود!

## ( دەریایٚ ڕەنج )

ـ ئەژ دەریایٚ ڕەنج، ڤەچە دگواری؟

ـ ڤە تەنیا کەشتییەکەم: "برین گیۆن" خوەم

❖❖

## ( دریای رنج )

ـ از دریای رنج، چگونه خواهی گذشت؟

ـ با یگانه کشتی‌ام: «زخمِ جانِ» خویش

## ( پاشخوانەیل کاتی )

ژیان، نیشانەیٚ پرسیار هەرایٚهەریٚگە

ئیمە، پاشخوانەیلیٚگ کاتی.

❖❖

## ( جواب‌های موقتی )

زندگی، علامت سؤالی‌ست دایمی

ما، جواب‌هایی موقتی.

## ( دەرفەت )

ژیان، دەرفەتیٚکە ئەڕەیٚ "درەخت‌بیین"

دە ناوهەیٚن دۆ زەردەوایٚ پایزی

❖❖

## ( فرصت )

زندگی، فرصتی‌ست برای «درخت‌بودن»

در فاصله‌ی دو زردبادِ پاییزی

## ( ده ڤلاتێ ک ئازادی، باڵخەنجەرەێ لاڵێکە )

پەژارە، ئیسفایێکە

ئێمە ئەلۆژنێ.

برین، کلکێکە

ئاماژە ڤە ئێمە کەرێ.

ژۆ، دەمێکە

ئێمە چەشێ.

هەر ڕوو

ئەلۆژێمن

ئمداڵەکێ نوخسگرتن و

پووقە!

ژیان، مردنێکە ک

چووارشە ڕێ کەرێ.

❖❖

## ( در سرزمینی که آزادی، چلچله‌ای لال است )

اندوه، نگاهی‌ست

ما را انتخاب می‌کند.

زخم، انگشتی‌ست

به ما اشاره می‌کند.

درد، دهانی‌ست

ما را می‌چشد.

هر روز

انتخاب می‌شویم

سپس نشانه‌گیری و

شلیک!

زندگی، مرگی‌ست که

وارونه راه می‌رود.

## ( بێکشکی وە "پرۆمتە" وتیمن )

نە، پرۆمتە!

تیەریکیی مێژووەگەێ خۆنبار مرۆڤ

وە بلێزە و چۆمەتێگ، ڕووناک نیەود...

تکایە ئی‌جارە، "خوەر" ئەڕاێ ئیمە بدز!

❖❖

## ( مخفیانه به «پرومته» گفتیم )

نه، پرومته!

تاریکیِ تاریخِ خونبارِ انسان

با شعله و مشعلی، روشن نمی‌شود...

لطفاً این‌بار، «خورشید» را برای ما بدزد!

# بۆش کامە وەرزی؟

## ( بگو کدامین فصلی؟ )

ـ ٢٧٢٣ کوردی / ١٤٠٢ هەتاوی (خورشیدی) ـ

## ( ئەڵکەنیایێە )

هەمیشە پایزم...

دەسێک، بایێ گرنگ دایێە ئەڵ هەبوونم!

❖❖

## ( برکنده ز جا )

همیشه پاییزم...

دستی، باد را بر هستی‌ام گره زده!

## ( ئەڵۆژانن )

چ سەوز

چ زەرد

چ کەفەنپووش

هەر وەیجوورە، درەخت دمینم!

دە وڵاتێ ک تۆ

شنەبایێ هەر چوار وەرزەکەێ بوویی.

❖❖

## ( انتخاب )

چه سبز

چه زرد

چه کفن‌پوش

همچنان، درخت می‌مانم!

در سرزمینی که تو

نسیمِ هر چهار فصل‌اش باشی.

## ( کاتەیل ئارامشت )

هەرچگ فێشتر و فەرەتر

خوەم دسپارمە دەس سروەیۆ زانین

ڤەردەڤ دایە، ڤە ڤێنەیۆ زڵفپەرێشانیی دارین!

ئۆ ستار، دەناو ناخ و دەرینم قیل‌تر دنیشۆ

جوور ڤەچڕ "کۆستان"، ئەڵ چەق قورسیی شێعر "گەریلا".

هۆر ڤە ئازادی دکەرم؛

**سێفستانێ دەناو دلّم گولّ دکەرێ و**

**هەنگێ، ئەلّ تیەلّیی ڕووژگار هەنگوین دپرژنێ.**

**هۆر لە مرۆڤ دکەم؛**

**ئەلّ سەر و سەکوت گرد گەردوون**

**ـ ک ئەژ دەروەچ هۆرشەێ ئێمە، تەماشاێ خوەێ دکەێ ـ**

**زەردەخەنەێگ نەخش دبەسێ.**

**هەرچگ ڤێشتر و فەرەتر**

**خوەم دسپارمە دەس ئافتاو زانسن**

**ئۆ سێف، د ناو ئاینەێ گیانم فرەوا دووێ.**

❖❖

## ( لحظه‌های آرامش )

**هرچه بیشتر و بیش**

**خود را به دستِ نسیمِ آگاهی می‌سپارم**

**رها، همچو گیسوپریشانیِ جنگل!**

**و آرامش، در اندرونم ژرف‌تر می‌نشیند**

**مثل کلمه‌ی «کوهستان»، بر مرکزِ ثقلِ شعرِ «گریلا».**

**به آزادی می‌اندیشم؛**

**سیبستانی در قلبم می‌شکوفد**

**و زنبوری، بر تلخیِ روزگار عسل می‌پراکند.**

به انسان می‌اندیشم؛

بر سیمایِ همه‌هستی

ـ که خویش را از روزنه‌ی اندیشه‌ی ما می‌نگرد ـ

لبخندی نقش می‌بندد.

هرچه بیشتر و بیش

خود را به دستِ آفتابِ دانستن می‌سپارم

و سیب، در آینه‌ی روحم تکثیر می‌شود.

## ( هزاره‌ێ هشکه‌ساڵی )

جه‌هان،

ڤه بێ تو ئه‌ێ دووس!

تونگ ئاو هالییێک بی ــ

ماسی سۆره‌یش نه‌ڤیاتام

م ئه‌ژ تژنه‌ی دمردم.

❖❖

## ( هزارەی خشک‌سالی )

بی تو ای دوست!

جهان،

تُنگ آبی خالی بود ـ

ماهیِ قرمز هم اگر نمی‌بودم

از تشنگی می‌مُردم.

## ( ئەرا ژن، ژیان، ئازادی )

پەلکە و زلٚفد

ئەودەر کەوشەن وشەگان نۆسم

لەناو ڕستەیلێگ وەبێ خاڵ کووتایی

شووڕ

تا بان شانەیل خۆنین خێیاوان

ئوو دەروەچەگانیش چەکیاێە هێلم:

ماڵەگەێ دەردەدارمان،

پاژێگ لە چیرووکە ڕەنگینەگەێ بانانە

ئەگەرچە ئیسکە

تا قوڕگ

وە ئەزرەت هوونکای سروەێگ

سزیاێە!

❖❖

## ( برای زن، زندگی، آزادی )

زُلف و گیسویت را

بیرون از محدوده‌ی کلمات می‌نویسم

در جمله‌های بدونِ نقطه‌ی پایان

فروهشته و رها

تا روی شانه‌های خونینِ خیابان

و پنجره‌ها را نیز باز می‌گذارم:

خانه‌ی رنجور ما،

فصلی از داستانِ زیبای آینده است

اگرچه اکنون

تا گلو

در حسرتِ خنکایِ یک نسیم

سوخته است!

## ( کشمات )

ئاسمان وەرد گشت باڵنەیلێ دکەفێیەو خوار

دار وەگەرد گرد ئاواتەیل ڕەنگامەێ هشکەو دبێ

شەقامیش وەرد گشت ویرمانەیلێ دمرێ و

دی هیچ کەسێک

وە هیچ ژوانگەێ نەێڕەسنێ

ڕووژێ ک وا، عەتر پرچەیل تۆ فەراmووش بکەێ.

❖❖

## ( سکوت ژرف )

آسمان با همه‌ی پرنده‌هایش سقوط می‌کند

درخت با همه‌ی آرزوهای رنگارنگش می‌خشکد

خیابان هم با همه‌ی خاطراتش می‌میرد و

دیگر هیچ کسی را

به هیچ وعده‌گاهی نمی‌رسانَد

روزی که باد، عطرِ موهای تو را فراموش کند.

## ( ڕاڤەیٚ چاوانت )

لە ژێر پێڵوەگانت

زۆنەترین هەڵبەست جەهان شەپووڵ دەیٚد؛

دەریایٚگ قۆل

ک هەر ساتێگ ژە بیٚئارامییەگەیٚ

سەرەتایٚ وەرز خەمناکێگ ترەک لە وارانەیل وەرزییە.

لە ژێر پێڵوەگانت

قەشەنگ‌ترین نهێنیی جەهان خەفتگە

دەریایٚگ قۆل

ک ئارامیی سات‌وەسات وسان و بیٚدەنگییٚ

لێوالێو لە پشکڤین گوڵەیل ئاوەزین و ئاشناییە

بۆش! پرتووک چەوەیلت چۆ ڕاڤە بکەم؟

تا بیٚچەتر و بیٚداڵدە

لەناو شەقامەیلێگ ک وەسنگەیٚ لێزمەگان ناکاو، جیٚگومانن

خافڵگیر نەمینم

ئوو وشەیلیٚ ک وەک دەنکە ڕێخەیل بۆچگ

ئەژ ناوەیٚن کلکەیلم دکەفنەو خوار

له لێواره وەرفراوانەگان بۆنت

بوون وه ماسییەیل سۆەر لێوەخەنه و

لەناو دەریایٚ ژێر پێڵوەیلت

هەروا وەرەو هەرمان

مەله بکەن...

❖❖

## ( تفسیرِ چشمانت )

زیر پلک‌هایت

کهن‌ترین شعرِ جهان موج می‌زند؛

دریایی ژرف

که هر لحظه‌ی بی‌قراری‌اش

سرآغازِ فصلِ غمگینِ دیگری از باران‌های موسمی‌ست.

زیر پلک‌هایت

زیباترین رازِ جهان خفته است

دریایی ژرف

که آرامشِ لحظه‌لحظه‌های سکون و سکوت‌اش

سرشار از شکفتنِ گُل‌های ادراک و آشنایی‌ست

بگو! کتابِ چشمانِ تو را چگونه تفسیر کنم؟

تا بی‌چتر و بی‌پناه

در خیابان‌های مشکوک به رگبارهای ناگهانی

غافلگیر نمانم

و واژه‌هایی که همچون دانه‌های کوچکِ شن

از میان انگشتانم رها می‌شوند

در سواحلِ وسیعِ بودن‌ات

بدل به ماهیان سرخِ لبخند شوند

و دریای زیر پلک‌هایت را

همچنان رو به ابدیّت

شنا کنند...

## ( ناوه‌كه‌ت، شوورِشێكه‌! )

ئه‌ژ بن‌بنین ده‌رقه‌نه‌ل

ناوه‌كه‌ت هاوار كردم...

شانه‌یل خوه‌یٚ ئه‌ژ به‌رف ته‌كه‌ن، كۆ

بییه‌ ڤهارا!

❖❖

## ( نام‌ات، یک انقلاب است! )

از قعرِ درّه‌ها

نام‌ات را فریاد زدم...

کوه، شانه‌های خود را از برف تکانید

بهار شد!

## ( ڤرِینە )

ئەڤرێکیش ها ناو ڕەگەلم

ئەژ پەسا، ناوەکەت دڤارێ!

❖❖

## ( هذیان )

یک ابر نیز درون رگ‌هایم هست

یکریز، نام تو را می‌بارد!

## ( ئەگەر وەفر بۊاتاید )

ئەگەر وەفر بۊاتاید و

شەوانە، نەرمەنەرم

دە بان سەرم بواریاتاید

منیش دڤیمە کۊەسانێگ

وەگەرد سەرکڵاوانێگ سەختتر ژە ئەستەم

وەگەرد زنارەیلێگ بتەوتر لە دڵنیایی و

دەروەنەیلێگ بێبنتر ژە تەنیایی

ئەوسا وڵات باوەشم،

پڕاپڕ ئەژ بیین ت

دڤییە چەرمگیی ڕەها

چنەو چەرمگ

ک شوونپایێ جاران و ئیسە و بانان

برینداریێ نەدکرد.

ئاهـ ! ئەگەر وەفر بۊاتاید و

شەوانە بواریاتاید...

❖❖

## ( اگر برف می‌بودی )

اگر برف می‌بودی و

شبانه، آهسته آهسته

بر فرازِ سرم می‌باریدی

من نیز کوهستانی می‌شدم

با قلّه‌هایی صعب‌تر از ناممکن

با صخره‌هایی محکم‌تر از یقین و

درّه‌هایی ژرف‌تر از تنهایی

آنگاه سرزمینِ آغوشم،

لبریز از حضورِ تو

سپیدیِ مطلق می‌شد

چنان سپید

که ردّپای گذشته و اکنون و آینده

زخمی‌اش نمی‌نمود.

آه! اگر برف می‌بودی و

شبانه می‌باریدی...

## ( هەڵسمان )

پەیٚ وێشەیٚ سووچیایٚ

چرایٚ واران دابگیرسن؛

ئڕا چەم

بڵێزەیٚ تارسە و تامازروویی!

ئەڵ زام خاک

ڤە بنەتوم همیٚ، مەڵهەم بنە و

ڤا، ژە [قیلەیٚ کەڵەشێر و] شەوەکیان ئاوایی بئاخنە!

... بەڵام وە نەریت نەورووزانە، ئەی وەهار!

ئڕا بەێتئەڵوەسەکەیٚ تکەڵ خوەرەتاویی سوو

بڵێسە ـ وشەیلیٚ بوو

سەوز و سوور و زەرد

تا ژە چاڵ و گڵکوو سەرد ساڵان لاڵ

قەقنەسەیل هاوار

جاریٚ تر، باڵەو بگرن.

❖❖

( رستاخیز )

بیشه‌ی سوخته را

چراغِ باران بیفروز؛

رود را

شعله‌ی اشتیاق!

زخمِ خاک را

به بذرِ امید مرهم نِه

و باد را، بیاکن از خروس‌خوانِ دِه!

... اما به رسمِ نوروزانه، ای بهار!

شاعرِ چکادِ آفتابیِ فردا را

شعله ـ واژه‌هایی باش

سبز و سرخ و زرد

تا از مَغاک سردِ سالیانِ لال

ققنوس‌هایِ فریاد

دگرباره درآیند به پرواز.

# ( بۆشه هەورەیل چاوانت بسرەون! )

سالاّنێگ

ت ئرمێس دڤارەنی و

م "ئۆدیسه"ئاسا

ڕێڤیاره سەرگەردانەگەیَ زەریاگان بیَئاگایی بۆم

کپ و بیَدەنگ، ئەڵ پانتایی ئاوان

وەرەو نووا دچیم

ئوو دوورگەیل و دیمەنەیل دەور و گژ

گشت ژە ئەڤە بۆچگ‌تر بۆن

ک دەناو مەتەڵ تیەڵ چارەنوس،

نیشانەێگ له کووتایی و پەرتخ بوون.

سالاّن فرەێگ وێیەرد

ئێمکه دەنگت دژنەفم

ک سرتەیَ ئارام و دۆرێگه

ئاوازێگ، بێگانه وەل پێشهاتەیل دواژەیا

نیشانەێگ جیاواز،

چۆ ئەودی کردن ناکاو تورِ هەڵفڕین باڵنده کووچەرەگان

**ئەودمایٚ تەم و کەڕەپیی خەس.**

**"پێنێلۆپە"یٚ چەم وەگریان!**

**ئێسە دی بۆشە هەورەیل چاوانت بسرەون و**

**ئەژ قۆلیی مەودایل تیەریک**

**وە تاسە و تامازروویی فانووس دەریایی ئەویندارێگ**

**ک کەڤرەیل کولەگرتەیٚ مەترسی ئاشکرا دکەیٚ**

**وە گیانفدایی پەڕاڤ مێهرەبانێگ**

**ک هەڵوەشاندنەوەیٚ گرد گوماهاتنەیلە**

**بنووڕە پێم!**

**بنووڕە پێم، گەرد چریکەێگ مزگانیدەر**

**تا لە ئاکاما**

**ئەڕا شەکەتییەیل کەشتیی ئیٚ گیانە**

**بەندەرێگ باوش ئەوکەیٚ....**

❖❖

**( به ابرهای چشمانت بگو آرام شوند! )**

**سال‌ها**

**تو اشک می‌باراندی و**

**من، «اودیسه»وار**

**مسافرِ سرگردانِ دریاهای بی‌خبری بودم**

**خاموش، بر پهنه‌ی آب‌ها**

**پیش می‌رفتم**

**و جزیره‌ها و چشم‌اندازهای پیرامون**

**جملگی کوچک‌تر از آن بودند**

**که در داستان تلخِ سرنوشت،**

**نشانه‌ای از پایان و مقصد باشند.**

**سالیانِ سال گذشت**

**اکنون صدایت را می‌شنوم**

**که نجوایی آرام و دور است**

**آوایی، بیگانه با پیشامدهای تکراری**

**نشانه‌ای دیگرگون،**

**همچون کشف ناگهانیِ ردّ پروازِ پرندگانِ مهاجر**

**از پسِ مِه غلیظ.**

**«پنلوپه»ی دیده گریان!**

**اینک دیگر به ابرهای چشمانت بگو آرام شوند**

**و از عمق فاصله‌های تیره**

**با اشتیاقِ یک فانوس دریاییِ عاشق**

**که صخره‌های کمین‌کرده‌ی خطر را افشا می‌کند**

**با ایثار یک ساحلِ مهربان**

**که فسخِ تمام گم‌شدگی‌هاست**

**نگاهم کُن!**

نگاهم کُن، با آوازی مژده‌بخش

تا سرانجام

برای خستگی‌های کشتیِ این جان

بندری آغوش بگشاید...

## ( وەدیهاتن )

هەڵبەسەیلم گرد

ئرِا تنن؛

گشت وشەیل

ئاخەیل و

ئەسرەیلم

گشت زەردەخەنەیل

هیوا و

داخەیلم.

چۆن ک ئەزانم،

ت جامەکە گومبییەکەێ گیان منی

چۆن ک ئەزانی،

م وێنە گومبییەکەێ تەنیایی تنم.

بنیش ئەڵ وەردەمم

تا لەناو گلارەیل یەکتری

وەدی بایمن.

❖❖

( میلاد )

شعرهایم همه

برای توست؛

تمام واژەها

آەها و

اشک‌هایم

تمام لبخندها

امید و

اندوهم.

چرا که می‌دانم،

تو آینەی گمشدەی جان منی

چرا که می‌دانی،

من تصویر گمشدەی تنهاییِ توام.

مقابلم بنشین

تا درونِ چشم‌های همدیگر

زادە شویم.

## ( دەنگت، ڕاز جەهانێگە! )

دارە گێڵاسێگ دەمڤەخەنە

پەپوولە کەوەیٚ سەرمەسێگ

گوڵووپ ڕووناک هەڵبەسێگ دە سۆک تەنیایی

گڵاڵی ئەژ ئەسرەل مانگ

دارستانێگ ژە ئاسارەیل نوو وەدیهاتە

یەیٚ ڕێی چیایی پڕ لە شوونپایل زاڕوویی

دەشتێگ، ئەسپەیل هۆرمان

باخێگ، سوورەگوڵەیل ئاوات و تاسە

پرتووکێگ لێوالێو ژە وشەیل کەمانچە و چەنگ و پیانۆ

یانە گشتیٚ هانە ناو دەنگ تۆ!

یانە گشتیٚ هانە ناو دەنگ تۆ!

❖❖

## ( صدایت، راز یک دنیاست! )

یک درختِ گیلاسِ خندان

یک پروانەی آبیِ سرمست

لامپِ روشنِ شعری در کنجِ تنهایی

رودخانەای از اشک‌های ماه

جنگلی از ستاره‌های تازه به‌دنیاآمده

یک جادّه‌ی کوهستانیِ پُر از ردّپاهای کودکی

یک دشت، اسب‌های خاطره

یک باغ، گُل‌سرخ‌های اشتیاق و آرزو

یک کتابِ لبالب از واژه‌های کمانچه و چنگ و پیانو

این‌ها همه در صدای توست!

این‌ها همه در صدای توست!

( بۆش، بخەن، بنووڕ! )

هەر گل ک قسەیٚ کەری

ڕەنگیٚ ڤە ڕەنگەل ژین زێیایٚ دوویٚ

هەر جار ک خەنیدن

گوڵێگ وە گوڵەیل وهار زێیایٚ دبیٚ

هەر گل ک ئیسفا گری

هەڵبەست تازەێگ دەناو دڵ هەبوون وەدی تیٚ

**بۆش!**

**بخەن!**

**بنووڕ!**

**بیلا تا نیمەچڵنگییەل ئی جەهانە**

**کەمتر و کەمترەو بوون.**

❖❖

**( بگو، بخند، بنگر! )**

**هر بار که حرفی می‌زنی**

**رنگی به رنگ‌های زندگی افزوده می‌شود**

**هر بار که می‌خندی**

**گُلی به گُل‌های بهار اضافه می‌گردد**

**هر بار که نگاه می‌کنی**

**شعر تازه‌ای در قلبِ هستی متولد می‌شود**

**بگو!**

**بخند!**

**بنگر!**

**بگذار ناتمامی‌های این جهان**

**کمتر و کمتر شوند.**

## ( ئەڕا گەوراترین ڕۆداو! )

گەوراترین ڕۆداو

هەمۆشە هەرئەوە نییە ک

لە نزیکت قوومیەێد.

جارجارێگ

یەیٚ لق گوڵ

ک ئەڵ مەودایٚ دۆرێگ پشکڤییە و

هەرگز ڕێی دەروەچ چەوەیل ت نازانیٚ

هەرئەو ئاوەخت گومابۆەسە

ک بوو و بەرامەگەیٚ ئەفسووناوییٚ

ئەڵ کووڵ وا

وەتاو تیەێدن

تا هەبۆنت بگرێدە وەر و

گشت دەرگایل جەهان

وە ڕۆ ت بچەکنیٚ.

گل‌گلیٚ

نەناس‌ترینەگەیٚ دۆەکەت

ئمڕوو بوودنە ناسیارترینەگەیٚ گیانت و

سادەترین ناوێگ ک ژنەفتۆدن (یا تەنانەت نەژنەفتۆدن)

بوود وە تەنیاترین و

قەشەنگ‌ترین بیانگ ژیاینت.

گەوراترین ڕۆداو

جارجارێگ هەرئەو "ناشۆ"ترینەسە

ک وە ساکاریی وارین وەفرێگ

وەناکاو گرێدەتە باڵووش و

وە وێنەیٚ تریفەیٚ مانگ

تیەریکیی دەورگردت لەناو بەێد

تا ڕازناکیی گەردوون و

ئەوین و

ڕاسی

باوەڕ بکەی.

❖❖

( برای بزرگ‌ترین حادثه! )

بزرگ‌ترین حادثه

همیشه همانی نیست که

در نزدیکی‌ات اتفاق می‌افتد.

گاهی

یک شاخه گُل

که در فاصله‌ای بعید شکُفته است

و راهِ دریچه‌ی چشمان تو را هرگز نمی‌داند

همان آرزوی گم‌گشته است

که رایحه‌ی سحرانگیزش

سوار بر دوش باد

شتابان می‌آید

تا هستی‌ات را دربر گیرد

و تمام دروازه‌های جهان را

به روی تو بگشاید.

گاهی

ناشناس‌ترینِ دیروزت

امروز آشناترینِ جان‌ات می‌شود

و ساده‌ترین نامی که شنیده (یا حتی نشنیده) بودی

بدل به تنهاترین و

زیباترین بهانه‌ی زیستن‌ات می‌گردد.

بزرگ‌ترین حادثه

گاهی همان «ناممکن»ترین است

که به سادگی بارشِ یک برف

ناگهان در آغوش‌ات می‌کشد

و چونان پرتو ماه

تاریکی پیرامونات را زایل می‌گردانَد

تا رازناکیِ عالَم را

عشق را

حقیقت را

باور کنی.

## ( بوودائاسا )

چیا

تنی

بێدەنگ و

بووداٸاسا.

چ ڤە زەردەخەنە

چ ڤە ئەسرین،

هەرچێ بووشم

بێژە زایەڵەی ڕەنگینییت

چشتێک نییە!

❖❖

## ( بوداوار )

کوه

تویی

بی‌صدا و

بوداوار.

چه با لبخند

چه با اشک،

هرچه بگویم

به‌جز پژواک زیبایی‌ات

چیزی نیست!

## ( دڵته‌نگی )

دڵم ئه‌ڕا ده‌نگت ته‌نگه

جوور شاخێگ

ک هیچ چشتێگ ناتانێ

کووتایی وه ته‌نیاییه‌گه‌ێ بارێ

بێجله پێژن چریکه‌ێ په‌له‌وه‌رێگ بۆچگ!

(خاک تیه‌نێ، یه وه واران وه‌ت)

❖❖

## ( دلتنگی )

دلم برای صدایت تنگ است

مانند کوهی که

هیچ چیز نمی‌تواند

به تنهایی‌اش پایان دهد

جز طنینِ آواز پرنده‌ای کوچک!

(خاکِ تشنه، این را به باران گفت)

## ( داخوازی )

وشەیٚ ئەڤشاردەیٚکم

ئەڵ ناون کرٍەیل کلکەلت.

... بنیسنەم!

❖❖

## ( طلب )

واژه‌ای مستورم

لابه‌لای خطوطِ انگشتانت.

... مرا بنویس!

## ( نزیک و دۆر )

ژان، وە ژان

وە ت نزیکترەو دڤم

بەرد، وە بەرد

ئەژ خوەم دۆر.

زام، وە زام

وە ت نزیکترەو دڤم

بگدە، وە بگدە

ژە خوەم دۆر.

ئەزانم

لە ئاکاما، ئەنوو ئەنارەگان پەژارەم

ک چەنە هەزار پایز

چەوەڕێ بینە،

ئەڵ ئاسمان شانەیلت

بوودە وارانێگ

سوور

سوور

ڕاس لە وێنەیٚ هەرئەو وشەیٚ قەشەنگە ک
هەرچەنیش دواژەیٚ بکەی
هەرجار
ئەڵسەر لەوەیلت
شەهید وەدی تیەدا!

❖❖

**( نزدیک و دور )**

درد، به درد
به تو نزدیک‌تر می‌شوم
سنگ، به سنگ
از خودم دور.
زخم، به زخم
به تو نزدیک‌تر می‌شوم
خنجر، به خنجر
از خودم دور.
می‌دانم
عاقبت، بغضِ انارهای اندوهم
که به اندازه‌ی هزار پاییز
منتظر بوده‌اند،
بر آسمان شانه‌هایت

بارانی می‌شود

سُرخ

سُرخ

درست مثل همان کلمه‌ی زیبایی که

هرچقدر هم تکرارش کنی

هر بار

روی لب‌هایت

شهید به دنیا می‌آید!

## ( هەڵکزیان )

ئەڵکزیانە

ژە ئەتر گەرم گیسەیلت ــ

کلگەیل وا

(م ئەو دار ڕێوارەسەم ک ئەڵ ڤێیارێ، ئەیچە وتم وە مانگ)

❖❖

## ( سوختن )

سوخته‌اند

از عطرِ گرمِ گیسوانت ــ

انگشتانِ باد

(من آن درختِ عابرم که در گذرگاهی، این‌گونه گفتم به ماه)

## ( شەڤەکی ڤە خەیٚر )

ئەر "شەڤەکی ڤە خەیٚر" نەڤەشی

ئەڵ پشت چراخ سۆر دمینن، تا شەڤ

زەردەخەنەیٚ من و خۆرەتاو

❖❖

## ( صبح به خیر )

اگر «صبح به خیر» نگویی

تا شب، پشت چراغ قرمز می‌مانند

لبخندِ من و آفتاب

## ( بەرد، زەریا، ئاسمین )

بیٚدەنگییەکەت

کەریٚکەمە هۆچیٚک بەردین!

چنەو ک

ئەڵگەردم وە سەردەم وەرەژ وشە

وە سەردەم وەرجە دەسپیٚک

ـ کەفتە، دە بن‌بنین تیەریکی ـ

بێزووان و

بێ زەمان

ئوو لە ویر هەرچێ هەس و هەرچێ خوداس

لە هۆر "زەروان"ـیش دچم.

قسەێ بکە!

ئەژ ئاو بیش

ئەژ کەو...

تا بووم وە چمکێ ئەژ زەریا

یا لەتێ ژە ئاسمین

ک تاهەێ، بوو دەنگەکەت بدەم

بووخوەش هەرمان ئەوین.

❖❖

( سنگ، دریا، آسمان )

سکوت‌ات

مرا مبدل می‌کند به یک هیچِ سنگی!

چنان که

بازمی‌گردم به دورانِ پیش از واژه

به دورانِ قبل از آغاز

ـ فروافتاده، در قعرِ تاریکی ـ

بی‌زبان و

بی زمان

و از یادِ هرچه هست و هرچه خداست

از یادِ «زروان» هم می‌روم.

حرفی بزن!

از آب

از آبی بگو...

تا گوشه‌ای از دریا شوم

یا تکّه‌ای از آسمان

که تا ابد، بویِ صدایت را بدهم

بوی خوشِ ماندگارِ عشق را.

## ( تیرڤاران )

ساووڵەل سێ

ڤە تفەنگەل کوور، پووقەنن...

خین دەرڤەچێک

پشکیا ئەڵ قەێ دیڤار.

پاساریی زەمان،

جوور دمایین دڵووپە ئەسر یەکڵەدارێک لاڵ

**ئەژ پاسارەکە کەفت ئەڵ ڕێی زەمی.**

**م بیمە چکرٍ ـ ئەڵڤەس نووێ**

**ئەڵ پەل پێنڤیسەکە**

**سۆر**

**ڤە ڤێنەێ لەۆەل زەمدارت**

**هەێک دە ژێر پاییزپڵە**

**هنا کەری**

**ئەڵ ئەنارەلەێ باخەکە.**

❖❖

## ( تیرباران )

اشباحِ سیاه

با تفنگ‌های کور، شلیک کردند...

خونِ یک پنجره

پاشیده شد بر روی دیوار.

گنجشکِ زمان،

مانند آخرین قطره‌اشکِ تک‌درختی لال

از لبِ بام بر زمین افتاد.

جوانه ـ سروده‌ای تازه شدم من

بر شاخه‌ی قلم

سُرخ

مثل لب‌های زخمی‌ات

وقتی زیر بارانِ پاییزی

انارهای باغ را

صدا می‌زنی.

## ( وێنا )

چاوان زێدەکەم

دو زام گەپن

دو نیشانەێ پرسیار بێپاشخوان؛

بەڵام ئەژ داوولەڵ وێنا

دو گلە باڵنەێ پەڕ سوورن

لە هیچ چشتێ زاورێیان نیەچوو.

❖❖

( تصوّر )

چشمانِ میهنم

دو زخمِ بزرگ‌اند

دو علامتِ سؤالِ بی‌جواب؛

به خیالِ مترسک‌ها اما

دو پرنده‌ی سُرخ پَرند

از هیچ چیزی نمی‌ترسند.

## ( دەمەتەقەێگ ک بۆە شێعر )

ـ نیشتمانەگەم تنی!

ـ تەنانەت نیشتمانێگ یەێکەسییش

هەوەجە وە ناسنامە دێرێ

ئەسە بیلە تا "ئەوین"،

ناوەگەم و ئاڵاگەێ هەمیشە شەکاوەم بوو.

❖❖

## ( گفتگویی که شعر شد )

ـ میهنم تویی!

ـ حتی میهنی یک‌نفره هم

نیاز به هویت دارد

پس بگذار تا «عشق»،

نامِ من و پرچمِ همیشه در اهتزازم باشد.

## ( ڕێیەکەیٚ تاسەخواز )

ـ "ڤەرچە ئێقە دێر بڕ کەری؟"

ـ ڕێیەکە، خەێراتر ئەژ پالم دچوو!

❖❖

## ( جادّەی مشتاق )

ـ "چرا این‌قدر دیر می‌رسی؟"

ـ جادّه، از پاهای من شتابان‌تر می‌رود!

## ( خوەێڕانایێن )

تێژترین بگدەت،

زەمەکەتە!

❖❖

## ( خودآموزی )

بُرّندەترین دشنەات،

زخمِ توست!

## ( پەلامار تەریکی )

گوڵبەرەفتاوان تاسە، دەناو نامەێک نیسەنن:

ـ گرد ڕووژەل دیرییت، شەڤن!

❖❖

## ( هجوم تاریکی )

گُل‌های آفتابگردانِ حسرت، در نامه‌ای نوشتند:

ـ تمام روزهای دوری‌ات، شب‌اند!

## ( ئەگەر بترکێمن )

ئاخ!

چ گەلەئاسارەیل نووێگ تۆەنن وەدی بان

ژە تەپتووز ڕێیەیلێ گ

هێمان وەگەرد یەکا نەچیمنە...

❖❖

## ( اگر قدم بزنیم آرام )

آه!

چه کهکشان‌های تازه‌ای می‌توانند زاده شوند

از غبارِ راه‌هایی که

هنوز با هم نرفته‌ایم...

## ( ماسی‌بیین )

هەگ قسە کەید

ژە کۆستان وشەیلت

وەفراو زوڵاڵ ڕێ داگرێ و

دە لاخوار دووڵەیل بێدەنگیی م

چەم تازەێ وەدی تێد.

دزانم ک زەریایل و شازەریایلێگ ترەکیش

لەناو جەهانت هەن

ک هێما نەناسیاێ مەننە

وەک دریژەێ کەو کراسەگەت

یا دریژەێ ملپێچەگەێ فیرووزەییت

وە دەم وا.

هەگ قسە کەید

تەنیا ئاوەختم، ماسیبیینە!

❖❖

## ( ماهی‌شدن )

حرف که می‌زنی

از کوهستانِ کلمه‌هایت

برفابِ زُلال جاری می‌شود

و در پایین‌دستِ درّه‌های سکوت من

رودخانه‌ی تازه‌ای به دنیا می‌آید.

می‌دانم که دریاها و اقیانوس‌های دیگری هم

در جهانِ تو هست

که هنوز ناشناخته مانده‌اند

مثل امتداد آبیِ پیراهن‌ات

یا ادامه‌ی شال‌گردنِ فیروزه‌ای رنگت

در باد.

حرف که می‌زنی

تنها آرزویم، ماهی‌شدن است!

## ( مەودا و مەرگ )

مەودایٚ ناوەیٚن ئیمە

منیٚدە مەرگ!

گاجار ئەوقە دۆر

ک چمان هەرگز نارەسیٚ

گاجار لەبە نزیک

ک چمانیٚ دی دەرفەتیٚگ نییە.

❖❖

## ( فاصله و مرگ )

فاصله‌ی میان ما

شبیه مرگ است!

گاهی آن‌قدر دور

که گویی هرگز نخواهد رسید

گاهی آن‌قدر نزدیک

که انگار دیگر فرصتی نیست.

## ( ئەگەر... )

ماسییەگان ڕەنگامەیٚ ئاوەخت

دۆر ژە دەلیا

ئەڵ شوورەکاتەیل هشک و بیٚ واران

ڤەیجووره ڤە ترسەترس نەیٚمردن؛

ئەگەر گڵاڵەیل کوور جەهان

ناونیشان دەسەیل ت بزانسیاتان.

❖❖

## ( اگر... )

ماهیانِ رنگارنگِ آرزو

دور از دریا

در شوره‌زارانِ خشک و بی باران

این‌گونه با ترس‌ولرز نمی‌مُردند؛

اگر رودخانه‌های کورِ جهان

نشانیِ دست‌های تو را می‌دانستند.

## ( بێهنۆک )

**من، تۆ**

**ئیمە، ئیوە**

**،**

**،**

**،**

**بێهنۆکەگان، بەرزترین دیوارەیل جەهانن!**

❖❖

## ( ویرگول )

**من، تو**

**ما، شما**

**،**

**،**

**،**

**ویرگول‌ها، بلندترین دیوارهای دنیایند!**

## ( ئاماژە )

دەریا، پەپوولە کەوەیٚ مەزنێگە

ئامادەیٚ باڵەوگرتن

ژە سەر کلگەیلت

هنایٚ، ئاماژە کەی وە وڵام پرسیارێگ

ک هێمان ئەڵسەر لەوەیل تینگم

لەناو پیلەگەیٚ ها خەو!

❖❖

## ( اشاره )

دریا، پروانەی آبیِ عظیمی‌ست

آمادەی پرواز

از نوکِ انگشتانت

وقتی، اشاره می‌کنی به جوابِ پرسشی

که هنوز روی لب‌های تشنەی من

درونِ پیلەاش خواب است!

## ( گووڕسان ناخمان! )

ئیسه دی

هەر مرۆڤ، گووڕسانێگە!

چۆنکە دە ناخ هەرکاممان

سۆەرپووسێگ تیرواران کریاێە و

لە قولێتیسەیٚ گڵاڵ خۆن خوەیٚ، دۆایین ئاوازەگەیٚ خوەنێیە

کوردێگ ڤە ئاخەبانوو و سەرڤەنەگەیٚ لە دار دریاێە و

دە ناون زەوی و ئاسمان، ئەڕا دومایین جار هەڵپەڕییە

جۆلەکەێگ دەنام کوورەیٚ ئاگر جەهان نوو، سووزیاێە و

ئەڵ بارگەیٚ خوداگەیٚ "ئاشویتس"

تا دمایین وشەیٚ نقاگەیٚ، بییە ڤە خوڵەمڕ.

ئیسکە دی لە ناخ هەرکاممان

بۆمێگ تووقیاێە

شەڕ تازەیٚ هەڵگیرسیاێە و

"هیرۆشیما"، "هەڵەبجە" یا "شەنگال"ـێگ هەس.

ئێسە دی دە ناخ هەرکاممان

دارستانێگ تا دۆایین وەڵنگ هیوایٚ سزیاێە و

لیکه ئاسارەێگ مردگه

پیره دەلیایێگ، وشکەڵاتێیه و

کەژێگ نەمر داخرووومیایێه.

ئێرەنگه دی له ناخ هەرکاممان

سێیاپووسێگ ئەڵ دەسەل شەو ڤه چوارمێخه کیشریایێه

یارسانێگ وه تاوان "ئەنەلحەق" وتن تەمیرەگەیٚ

لەناو گڵپەگڵپ سەردێگ، سووتیایێه

مەسیحییێگ، وه مدووم نادیارێگ مسڵمانێگ کوشتێیه

مسڵمانێگیش هەر وه ئەو مدووم نادیاره

خوَن مەسیحییێگ ڕژانێیه.

ئمکه دەیٚ هەرچی فرەتر دەبارەیٚ ژین چنه دێمن

کەشتیی وشەل، ئاوەژوو دبیٚ و

ئەژ دەریاپەڕەیل حەقیقەت، دیرترەو دووێمن

ئوو دەنگمان جوَ نوقمەوبوَەێگ له وەردەڵەک گێژاو ناهمێدی

فێشتر و فەرەتر بوو مردن دەێدن!

❖❖

( گورستانِ درون‌مان! )

اکنون دیگر

**هر انسان، گورستانی‌ست!**

**چرا که درونِ هرکدام‌مان**

**سُرخ‌پوستی تیرباران شده و**

**در میانه‌ی رودِ خونِ خویش، آخرین آوازش را خوانده است**

**کُردی با دستار و سربندش به دار آویخته شده و**

**میان زمین و آسمان، برای آخرین بار رقصیده است**

**یهودی‌ای در کوره‌ی آتشِ جهانِ نو سوخته و**

**در بارگاه خدایِ «آشویتس»**

**تا آخرین کلمه‌ی دعایش، خاکستر شده است.**

**اکنون دیگر درونِ هرکدام‌مان**

**بُمبی منفجر گشته**

**جنگ تازه‌ای برپا شده و**

**«هیروشیما»، «حبلچه» یا «شنگال»ی هست.**

**اکنون دیگر درونِ هرکدام‌مان**

**جنگلی تا آخرین برگِ امیدش سوخته و**

**ستاره‌ای جوان مُرده است**

**دریایی پیر، خشکیده و**

**کوهی نامیرا فروریخته است.**

**اکنون دیگر درونِ هرکدام‌مان**

**سیاه‌پوستی بر دستانِ شب مصلوب شده**

**پارسانی به جُرم «انا الحق» گفتنِ تنبورش**

**در میان آوایِ شعله‌هایی سرد، سوخته است**

یک مسیحی، مسلمانی را به دلیل نامعلومی کُشته و

مسلمانی هم به همان دلیل نامعلوم

خون مسیحی‌ای را ریخته است.

اکنون دیگر هرچه بیشتر درباره‌ی زندگی سخن می‌گوییم

کشتیِ کلمات، وارونه می‌گردد و

از سواحلِ حقیقت، دورتر می‌شویم

و صدای‌مان همچون غریقی دستخوشِ گردابِ نومیدی

بیشتر و بیشتر بوی مُردن می‌دهد!

## ( لیپاولیپ )

جوور وەفر، ک ئەژ کپی

چەشن کۆ، لە تەنیایی

هە چۆ ماڵ، ژە یادەوەر

وەک ئەنار، دە ئەسرین سۆەر

وە وێنەیۜ چەم، ک نیقەڵتووزە ئەژ چیین

لیپالیپم ژە دەنگد ـــ

تەنیا پیتێگ تریش بووار

تا گشت "خوەم"، دی بوو وە "خوەد"!

❖❖

## ( سرشار )

بەسان برف، که از سکوت

همچو کوه، از تنهایی

مثل خانه، از خاطره

همچون انار، از اشکِ سرخ

مانند رود، که مالامال از رفتن است

سرشارم از صدایت ــ

فقط یک حرفِ دیگر نیز ببار

تا تمامِ «خودم»، دیگر «خودت» شود!

## ( گوڵە مێخەک سوور )

لەێرە نیید

ئەمانگ گش کاتەگان شێعر،

شیشەیلێگ پەتیین

لێوالێو ژە بووخوەش بۆندا!

❖❖

**می‌تازند**

**چونان برق؛**

**می‌غرّند**

**چونان باد؛**

**تا در عمقِ بیشه‌هایِ مه‌گرفته**

**حادثه را در کمینِ روزگارِ بد بنشانند**

**و شرارِ زخمِ قلب‌شان را**

**به یک‌بار، ببارند.**

**... آری!**

**چهار سوارِ کُرد**

**بر پشتِ مَرکبِ زردِ غَضَب و خشم‌شان**

**به تاخت**

**رو به بُلندایِ زاگرس**

**شعله می‌کشند.**

## ( ڤیرووشە: ڤیر تاسەبارانەیٚ وێیەردە )

چەترەکەیٚ زەردت ئەڤکردی

هەنیٚ ئەژ لاکیچە تاریکەکەیٚ زمسان پلیای ــ

گوڵەبەڕووژەیٚ ئەڵ شوون خوەر بین!

گرد یە دین

دەروەچەل

دۆکەڵگیرەل

شەقامەل.

دەناو زڵەزڵ جەماوەر

دەناو دەلیا دەلیا لەف

لۆ کردن دو باڵنە دەناو نێیەت

یەکیٚ ئمیٚ

یەکیٚ ئژەو خەم!

گرد یە دین

وایٚ سەرد

پەلەکەیٚ ڕێت درەخت

دارتەێلەل.

پەنجە بیچگەکەت گورمچەو کردی

پڕۆکە وەفرەیل دەنام هڵم و گڕەێ هناسەیلت تاویان

زەردەخەنە کردی ئەڕا ئاسمان

ئەڕا زەۆ

ئەڕا جەماوەر

ئمجا دەنگ هاوارت وەردێیان بەرزەو کردی:

"بژی ئازادی!"...

"بمرێ چەکمەبوور!"...

گولە و ئاگر بی

خۆن بی و قیلتاو.

گرد یە دین

دەروەچەیل

شەقامەیل

پەلەکەێ ڕیت درەخت.

سی ساڵ وێیەرد

دەمەڵوەس ملهوڕەکەێ چەکمەبوور نوویش کەفت

بەڵام سوورەگوڵەکەێ دەنگ ت

**هێمانیش جوور بڵێسەیٚ ئاگریٚ**

**ئەڵ ناوڕاس ئاسمانە کەوەکەیٚ شار**

**باڵەپیتە کەریٚ!**

**گرد یە دڤینن**

**م**

**ڤەگەرد دو باڵنە ک دەناو نێیەم لۆ کردنە**

**یەکیٚ ئمیٚ**

**یەکیٚ ئژەو خەم!**

❖❖

## ( نوستالژی: یاد حسرت‌آمیز گذشته )

چترِ زردتو وا کردی

وقتی از پس‌کوچەی تاریکِ زمستون پیچیدی ـ

آفتابگردونی پیِ خورشید بودی!

اینو همه دیدن

پنجره‌ها

دودکشا

خیابونا.

میونِ غُلغلِ جمعیت

میونِ دریا دریا موج

آشیون کردن دو پرنده توىِ نگات

یکی امید

یکیشون غم!

اینو همه دیدن

بادِ سرد

شاخه‌ی لختِ درخت

تیراىِ برق.

مشتِ کوچیکتو گره کردی

دونه‌برفا توىِ هُرمِ نَفَسات آب شدن

لبخند زدی به آسمون

به زمین

به جمعیت

بعد فریادتو همراهشون سَر دادی:

«زنده‌باد آزادی!»...

«مرگ بر دیکتاتور!»...

گلوله بود و آتش

خون بود و آسفالت.

اینو همه دیدن

پنجره‌ها

خیابونا

شاخه‌ی لختِ درخت.

سی سال گذشت

نقابِ دیکتاتورِ تازه هم افتاد

اما گُل سرخِ صدایِ تو

هنوز هم مثِ یه شعلەی آتیش

وسطِ آسمونِ کبودِ شهر

پَرپَر می‌زنه!

اینو همه می‌بینن

من

با دو پرنده که تویِ نگام آشیونه کردن

یکی امید

یکیشون غم!

## ( گوورانیی چریک )

ئەوین، هەڵفڕینە

دەلیا، ئاسمان هەڵفڕین دڵووپەیلە

وەداخا، ک لە نەبۊن گەورەێ ئەوین

مرۆڤ، مرداو خەون و خەیاڵەیلە!

ت ئەی ژە لانەماێ کانییەگان و چەمەگان، چریک!

وه چریکەیٚ تفەنگەکەیٚ تۆڕەیی و گرژیی خوەد

گوورانییێک ئەڕایٚ ئەوین... گوورانییێک ئەڕایٚ ژیان بخوەن

شەوانە لە بلٚێنای کەش و چیایٚ دۆر.

بەشکەم هەم بچەقن،

لەناو ڕەگەیل شەکەت و کەو زەێن مەردمان شار

هەلاٚلە سوورەیل نۆر.

❖❖

## ( ترانەی چریک )

عشق، پرواز است

دریا، آسمانِ پروازِ قطره‌هاست

دریغا، که در فقدانِ بزرگِ عشق

آدمی، مردابِ رؤیاهاست!

تو ای ز نسلِ چشمه‌ها و رودها، چریک!

با نوایِ تفنگِ خشمِ خود

ترانه‌ای برای عشق... ترانه‌ای برای زندگی بخوان

شبانه بر فرازِ کوهِ دور.

باشد که باز بشکُفند،

در رگانِ خسته و کبودِ ذهنِ مردمانِ شهر

لاله‌های سرخِ نور.

# ئی زامە، ئاشارەو نێیەو!

## ( این زخم، پنهان‌شدنی نیست! )

ـ ۲۷۲۱ کوردی / ۱۴۰۰ هەتاوی (خورشیدی) ـ

## ( ڕاو )

سالاّن سالّە

دەناو چەمەکەیٚ گرٍگرٍ لیٚخن و گلیٚک لرپەکەر ناخم

سەرگەرم مەلە کردنم.

هەر ڕوو، تاسەخواز و دەس‌ئەڵنەگر

تا دیردەس دیریٚ دچم و

ڤە قولاو پرسیاریٚک نوو

خوەم، خوەم ڕاو کەرم!

... ئۆ هەر ئی مەرگ ڕەنگین واژاوە،

م (ماسی سۆرەکەیٚ تەنیایٚ ناو چەم و ڕاوکەرەکەیٚ)

ژیینیٚ.

❖❖

## ( شکار )

سال‌هایِ سال است

در رودخانه‌ی گهگاه گل‌آلود و گاهی زُلالِ درونم

مشغولِ شنا هستم.

هر روز، مشتاق و خستگی‌ناپذیر

تا دوردستِ بعیدی می‌روم و

با قلّابِ پرسشی تازه

خودم، خودم را شکار می‌کنم!

... و همین مرگِ زیبایِ مکرّر،

به من (ماهیِ قرمزِ تنهایِ درونِ رود و صیّادش

زندگی می‌بخشد.

## ( ئاویی دۆر )

تارمایی

یا شەوەیٚ شەوانە نییە

ئیٚ قلاٚسییە ــ

ڕاسیی خەمناک ڕووژانەیٚ ئیمەس

ک هەر وە سات

پەیٚ دۆرییەکەت قیژنیٚ

ئەیٚ ئاویی دۆر!

ک ناوت "ئازادی"ـیە.

❖❖

( آبیِ دور )

شبح

یا کابوسِ شبانه نیست

این کلاغ سیاه ـ

واقعیتِ غمناکِ روزانه‌ی ماست

که هر لحظه

دوری‌ات را جیغ می‌کِشد

ای آبیِ دور!

که نام‌ات «آزادی»ست.

( ساز بێدەنگی )

ساز بێدەنگییم ئەز

بژنەوەم، بێ پێژەن...

❖❖

( سازِ سکوت )

سازِ سکوت‌ام من

بی‌زخمه، مرا بشنو...

## ( ئی زامە، ئاشارەو نێیەو! )

ئەرێ لەناو بێدەنگیی ڕەها
هەڵفڕین خوّنالین کەمووتەرێ
چەوەیل خەمسەرد خەڵک
وەرەو ئاسمان ئەڵگەردنێ؟! ـ
لە ژێر هێرش وەفر تەنیایی سەدە
ژە م نەخواز هاوار نەکەم
ئی زامە، ئاشارەو نێیەو!

❖❖

## ( این زخم، پنهان‌شدنی نیست! )

در سکوتِ مطلق آیا
پروازِ خون‌آلودِ کبوتری
چشمانِ بی‌خیالِ مردم را
به سمتِ آسمان خواهد چرخاند؟! ـ
زیر هجومِ برفِ تنهاییِ قرن
از من نخواه فریاد برنیاورم
این زخم، پنهان‌شدنی نیست!

## ( کەمێ مەنە وە مانگ )

چیا، هەرچێ بڵێن‌تر بوو

خەمبزوێن‌ترە ــ

چمان کەمێ مەنە وە مانگ

بڕ نەکردێیە!

❖❖

## ( کمی مانده به ماه )

کوه، هرچه بلندتر باشد

غم‌انگیزتر است ــ

انگار کمی مانده به ماه

کم آورده است!

## ( ئەسپ چوویین )

ئەسپەکەێ چوویین

ئێمە ڤە بنبنین دووزەخ ڕەسەن ـ

ئاخ زاڕوویيم!

ئێمکە ڤە پاپێیا گرەک ئەژ ئی ڕێیە گلارێمن.

❖❖

## ( اسبِ چوبین )

اسبِ چوبین

ما را به قعرِ جهنّم رساند ـ

آه کودکی‌ام!

حالا با پایِ پیاده باید از این راه برگردیم.

## ( ڤەدڵ چڕ )

دەمم، ناو کەس دە ڤیرێ نییە

ڤە دڵم دووس چڕم!

❖❖

( دل‌آواز )

دهانم، نامِ کسی در خاطرش نیست

دوست را با دلم صدا می‌زنم!

( نسمەی تەریک )

هەیگوا

ئی جیلەی سەرد ناو ڕەگەل ئێمە

خین مۆنگە.

"گردیلک پڕ"ـیش ک بوویٚم

نسمەی تەریکی دیٚریٚم!

❖❖

( نیمەی تاریک )

گویی

این جنبشِ سردِ درونِ رگ‌هایِ ما

خونِ ماه است.

«قرصِ کامل» هم که باشیم

نیمەی تاریکی داریم!

## ( داک پەژارە )

زەڵەت نەچوو!

ئی داکە ک ئەژ دەرز تێوڵم درەتێیە

پەژارەێکە (کوتێ ژەێ ئەنوو، کوتێ تر ئەسر)

سرڕ و کوڕ

ڕێی گەلی و چەوم گوم کردێیە!

❖❖

## ( شاخِ اندوه )

نترس!

این شاخ که از وسطِ پیشانی‌ام بیرون زده

اندوهی‌ست (نیمه‌اش بُغض و نیمه‌ی دیگر اشک

مات و مبهوت

راهِ گلو و چشمم را گم کرده است!

## ( زام هەنار )

دە بنچڕ تەنیایی

زیڕزیڕەکێ

بێدەنگی پاشنێ

ئەڵ ساتەیل ـ

ویرمانەیل

وە بێمدوو هەوگل کەن

لە ژێر واران،

وە وێنەێ زام هەنارەیل پایزی!

❖❖

## ( زخمِ انار )

در ژرفنایِ تاریکِ تنهایی

زنجره‌ای

سکوت می‌پاشد

بر لحظه‌ها ـ

خاطرات

بی‌سبب عَود می‌کنند

زیرِ باران،

همچو زخمِ انارهایِ پاییزی!

## ( دووانه )

**تا مەزگ سقان گیانم، دووانەیٚکم!**

**یەیٚ نسمەم هابیل و**

**نسمەیٚ تر قابیل.**

**تیرپشک نەیٚخسم**

**گەرد هەرکامیٚیان بکەفم، ئەوەیٚ ترەک خینم ڕشنیٚ!**

**باس زارووەل لفانەیٚ زەمان کەرم:**

**"یایٚهووش" و "فراmووشی".**

❖❖

## ( دوگانه )

تا مغزِ استخوانِ جانم، دوگانه‌ام!

یک نیمه‌ام هابیل و

نیمه‌ی دیگر قابیل.

قُرعه نمی‌اندازم

با هرکدام همراه شوم، آن دیگری خونِ مرا می‌ریزد!

از فرزندانِ همزادِ زمان، حرف می‌زنم:

«یاد» و «فراموشی».

## ( ئەلفوبێی مەرگ )

دەێرە، د ناو "ئەلفوبێ"ـیش

مین و بم کاڵینە!

قسە کەرێمن؛ ژۆن و ئێش ڤارێ

نیسنێمن؛ کارەسات و هەواڵ دڵتەزن کەفێ ئەڤ ڕێ

خۆنێمن؛ جهانێ گڕە گرێ.

ئەڤبڕەسن ئەژ بێدەنگیی ئی ڤڵات ئاخین‌داخین و خەمبارە!

دەێرە، ئەڵ پشت بزەخەنەێ هەر وشە

مەرگ کوڵە گرتێیە.

❖❖

## ( الفبایِ مرگ )

اینجا، درونِ «الفبا» هم

بُمب و مین کاشته‌اند!

حرف می‌زنیم؛ درد و رنج می‌بارد

می‌نویسیم؛ فاجعه و خبرِ ناگوارِ تلخ جاری می‌شود

می‌خوانیم؛ جهانی شعله‌ور می‌گردد.

سکوتِ این سرزمینِ حسرت‌زده و غمناک را دریابید!

اینجا، پشتِ لبخندِ هر واژه

مرگ کمین کرده است.

## ( زوان بەرد )

کۆەگانیش کەفتنەسە وەر گولە ــ
خوەزەو چەسپ زام
لە زوان بەردەیل ئەوبرەسیاتا!

❖❖

## ( زبانِ سنگ )

کوەها هم گلولە خوردەاند ــ
ای کاش چسبِ زخم
زبانِ سنگ‌ها را می‌فهمید!

## ( هادەیٚ، بەرجد وشەیٚ تاریک و لیٚلٚیٚکە! )

ـ "هاتیٚ"!
لەی وشەیٚ بۆچگە
بگدەیٚ هەس و مەڵهەمیٚ
هیوایٚ هەس و هەراسیٚ
بانانیٚ هەس و هۆچکاتیٚ
... وە دڵنەرمی ژیینیٚ و وە دڵرەقی کوشیٚ!

❖❖

## ( شاید، قطعاً واژه‌ای گرگ‌ومیش است! )

ـ «شاید»!

در این واژه‌ی کوچک

خنجری هست و مرهمی

امیدی هست و هراسی

آینده‌ای هست و هیچ‌گاهی

... مهربانانه حیات می‌بخشد و سنگدلانه می‌کُشد!

## ( تەقەیٚ شەنگێ ئەژ گوپ سەردوسڕ فێڵ! )

تاکەگلێ

زەردەخەنەیٚک بڵنگیی دیڤارەل زندان دیاری کەریٚ و

لاوەنن، دووە پڵتووکەیٚ

تا چوارپایٚەکەیٚ ژین ئەژ ژیٚر پات فڕ بیٚ.

ئەڤ ماچ گەرمە، تەقەیٚ شەنگیٚکە

ئەژ ناو گوپ سەردوسڕ فێڵ

... تا بخوازی خوەت بییەڤ لا،

کوشیاینە!

❖❖

## ( شلیکِ گلوله‌ای از دهانِ سردِ نیرنگ! )

گاهی

لبخندی ارتفاعِ دیوارهایِ زندان را تعیین می‌کند

و نوازش، تلنگُری می‌شود

تا چارپایه‌ی زندگی را از زیر پایت پرتاب کند.

آن بوسه‌ی گرم، شلیکِ گلوله‌ای‌ست

از دهانِ سردِ نیرنگ

... تا بخواهی جاخالی بدهی،

کُشته شده‌ای!

## ( ته‌نیا شوون‌پا )

یه‌کلّه‌دار

ئه‌ڵ په‌راوێز هشکه‌ڵه‌ته‌ێ هه‌ڵه‌ت چووڵ

باڵاێ ده‌ناو بڵێزه‌ل تین و گڕۆ سووزێ.

ئه‌ژ ڕێیه‌ل ئاسمۆنی

بێجه‌ژ ته‌پ‌تووسێک

جیله‌که‌رێ نه‌ێگوارێ.

"ـ هۆ ڕێڤاره‌که‌ێ ته‌نیا!

ئمێد کامین ئامانج دیر

ئشنه گرٟگرته، ڤەرەڤ نووا دەرێکەت؟"

ئەڵ رٟێیەل زەمینی

جیلەکەرێ وێیار نەێکەرێ

بێجەژ تەپتووسێ

ئۆ جاپاێ ڤرەڤ نادیار

ک بارکووڵەێ قورسێ ئەژ تین و گرٟۆ

ئگەرد خوەێ ڤە کووڵ کێشێ.

❖❖

**( تنها ردّپا )**

**تک‌درخت**

**بر حاشیەی خشکیدەی صحرای تهی**

**قامت‌اش میانِ شعله‌های شوق و عطش می‌سوزد.**

**از جادّه‌های آسمانی**

**جز گردوغباری**

**جُنبنده‌ای گذر نمی‌کند.**

**«ـ آی مسافرِ تنها!**

**امیدِ کدامین مقصدِ دور**

**تو را این‌گونه مُلتهب، به پیش می‌بَرَد؟»**

در جادّه‌های زمینی

جُنبنده‌ای عبور نمی‌کند

جز گردوغباری

و ردّپایی رو به ناپیدا

که کوله‌بارِ سنگینی از شوق و عطش را

با خود به دوش می‌کشد.

## ( باڵنە و ئاوازە سۆرەکەێ )

ئەڵ پەلێ ئەژ دار ڕەگەلم

باڵنەێ نیشتێیە

ک هەمیشە، ئاواز سۆرێ چڕێ.

هەر من و ئەڵوەسەلم دەنگێ ئژنەۆێمن و

گولەێ (منێ ڤە ئەنووێ)

ک دە بلوورەێ گەلیی تفەنگ مەرگ، چەۆەڕێیە

تا یەێ ڕوو باڵ بگرێ و

دەناو گێژگێژاو سۆرەێ ئەۆ ئاوازە

خوەێ ڤە کوشت بێ!

❖❖

( پرنده و آوازِ سُرخاش )

بر شاخه‌ای از درختِ رگ‌هایم
پرنده‌ای نشسته است
که همواره، آوازی سُرخ می‌خواند.
تنها من و شعرهایم صدایش را می‌شنویم و
گلوله‌ای (شبیه یک بُغض)
که در نایِ گلویِ تفنگِ مرگ، چشم‌به‌راه است
تا روزی پَر بگیرد و
در غرقابِ سُرخِ آن آواز
خود را به کُشتن بدهد!

## ( واقوڕی )

ئەڤەیٚ ک مێیا بێیەتا، چی
ئەڤەیٚ ک مێیا درگا بچەکەنا، کپیا
ئەڤەیٚ ک مێیا بمەنا، گوم بی
ئەڤەیٚ ک مێیا باڵ بگرتا، کەفت
چ دنیایٚ چەپی‌چەوارشەیٚکە!
تا دخوازی باڵ ئەڵماڵی و بژیی
ڤە جاڵ کەسیٚ دمری ک قەت خوەت نەڤییە.

❖❖

## ( بُهت‌زدگی )

او که باید می‌آمد، رفت

او که باید در می‌گشود، خسته شد

او که باید می‌ماند، گُم گشت

او که باید پرواز می‌کرد، فرو افتاد

چه دنیایِ وارونه‌ای‌ست!

تا می‌خواهی آستین بالا بزنی و زندگی کنی

به جای کسی می‌میری که هرگز خودت نبوده است.

**( ئاهـ ! )**

**فەڵسەفەیٚ ڤەدی هەتن جەهان**

**هاتێر هەر ئیٚ "ئاهـ"ـە بوو ک مەکیشیمن ــ**

**هەنیٚ دارەل ئەنار، گوڵە مەکەن**

❖❖

**( آه! )**

**فلسفه‌ی پیدایشِ جهان**

**شاید همین «آه»ی باشد که می‌کشیم ــ**

**وقتی درختانِ انار، گُل می‌دهند**

## ( ئاشارئاشارەكی )

چەڤەلت ک نیقەنی

م ڤەر هەیّتاهەیٚ نادیارەڤ بیم.

ئاخ ئەڵنەکیّش!... نەگریّڤ!...

هەڵەیٚ تو ک نەڤی

مەرگ، ئاشارئاشارەکی سەریٚ نیّیەو!

❖❖

## ( قایم‌باشک )

چشم‌هایت را که بستی

من برای همیشه غیب شدم.

آه نکش!... گریه نکن!...

تقصیرِ تو که نبود

مرگ، قایم‌باشک سرش نمی‌شود!

## ( پرسیار کەڵێن )

هەبوون، پرسیار کەڵێنێکە و

ئەڤین، دەمەلاڵکیی دڵێک نەسرەو

ئەڕا زانسن واوێژ!

❖❖

## ( پرسشِ بزرگ )

هستی، پرسشِ بزرگی‌ست

و عشق، تمنّایِ یک قلبِ ناآرام

برایِ دانستنِ پاسخ!

## ( نوقم‌بیینێ ک ڕەنگینە! )

بنیشنەم ڤەلایێ بێ‌دەنگییەکەت

ک ئووره قیل‌ترین ئقیانووس جەهانە و

دڵووپ، تەنیا ڤە نوقم‌بیین ستار گرێ

❖❖

## ( غرق‌شدنی که زیباست! )

مرا کنارِ سکوت‌ات بنشان

که آنجا ژرف‌ترین اقیانوسِ جهان است و

قطره، تنها با غرق‌شدن آرام می‌گیرد

## ( ئەڵشکیان گەپ )

ئاو کوشتیمن

ئاگر وە دیل گرتیمن

خاک زامدار کردیمن و

هەوا شکەنجە دایمن.

لەێوا بۆ ک ئیمەیٚ مرۆڤ

وە تاجێک ژە خۆن سوورەگوڵ دە بان سەرمان و

بەێداخێگ لە بیٚدەنگیی قەناری دە قول مشتمان

بیمنە گەوراترین سەرکەفتەیٚ ئەڵشکیاگ کاکشان!

❖❖

## ( شکست بزرگ )

آب را کُشتیم

آتش را به اسارت درآوردیم

خاک را زخمی کردیم

و هوا را شکنجه دادیم.

اینچنین بود که ما انسان‌ها

با تاجی از خونِ گُل‌سرخ بر سرمان

و پرچمی از سکوتِ قناری در کف‌مان

بزرگ‌ترین فاتحِ شکست‌خورده‌ی کهکشان شدیم!

## ( وارشت )

واریدن و

له قوڵایی گیانم

چۆزەرە دەم

چۆ داربەڕۆ کۆەسان

ک نیوەێگ له لێ هەڵبەس فڕینه و

نیوەێ ترەکێ لاوەلاوەێ سان ــ

ئوو ئەوین، ئاسمانێگه

ک له ساڕووکییەگەت داکاسیایە.

❖❖

## ( بارش )

می‌باری و

در ژرفایِ جانِ خویش

جوانه می‌زنم

چونان بلوطبُنِ کوهستان

که نیمی از آن، شعرِ پرواز است و

نیمه‌ی دیگرش لالاییِ سنگ ــ

و عشق، آسمانی‌ست

که در سایه‌ات آرام گرفته است.

## ( ئاوێ ئەرەێ گەلیی هوشکبییەێ وشەیل )

قسەێ بکە ئەێ دووس!

تەنانەت وە بیچکیی دڵ باڵندەێ دەنگ‌چڕێ

تا دارسانێک

ڕازی و قانێ بیێ

ڤە مەنن ئەڵ سەر ڕەگ و ڕیشەێ وژ.

❖❖

## ( آبی برای گلویِ خشکیده‌ی کلمات )

حرفی بزن ای دوست!

حتی به کوچکیِ دلِ پرنده‌ای آوازخوان

تا جنگلی

مجاب شود

به ماندن بر روی ریشه‌هایِ خویش.

## ( ژان )

ئێ شوونپایێ بان وەفرە

ئۆشێ ک چیدە.

ئەو تەم تیرەێ سمنجە

ک وێنەێ پەلەوەرێگ، باڵەیلێ ڕاخستێیە تا ئەوپەڕ ئاسۆ

ئیشێ گلەو دما نیەخوەی. ـــ

هەمیشە هەر لەێوا کەمقسە بیتە و

کاریگەر

وەک مەودایێ تێخێگ وە بان پووسەو

ک بڕێ و دەم سۆەر هەنارێ

تا بنچڕ ژان

ڕۆت کەێدەو.

❖❖

## ( درد )

این ردّپای رویِ برف

می‌گوید که رفته‌ای.

آن غبارِ تیره‌ی سمج

که مثلِ پرنده‌ای، بال‌هایش را گسترده تا فراسویِ افق

می‌گوید بازنمی‌گردی. ـ
همیشه همین‌طور کم‌حرف بوده‌ای و
اثرگذار
همچون لبه‌ی تیغی بر رویِ پوست
که می‌بُرّد، و دهانِ سُرخِ اناری را
تا ژرفایِ تاریکِ درد
برهنه می‌گردانَد.

( پایزەچڕ )

ڕۆ کەرێ، سەراپایێ ماڵەکە
ئاهـ ! ڤە بێ دووس...

❖❖

( آوازِ پاییزی )

سر تا به پایِ خانه، درد می‌کند
آه! بی حضورِ دوست...

## ( زەردەخەنەیْ دڵ )

ـ ئی درگا، وە کام کلیل چەکیا؟

ـ بیْکلیلی

❖❖

## ( لبخندەی دل )

ـ با کدامین کلید، گشودە گشت این در؟

ـ بی‌کلیدی

## ( هەرمان )

هزار ساڵێ ترەک...

ئەڤ هیردڵە تووس بیْناوە

منم!

❖❖

## ( جاودانگی )

هزار سالِ بعد...

آن ذرّەی غبارِ بی‌نام

منام!

## ( بەردتاش )

ـ ها چە کەری پەژارە؟

ـ ئەژ بەرد دڵ، پەیکەرێ تاشم

❖❖

## ( سنگ‌تراش )

ـ چە می‌کنی تو ای اندوە؟

ـ تندیسی می‌تراشم، از سنگِ دل

## ( ڕەنج بێڤەر )

هشکەگڵاڵ

ڤەرەڤ دەریا دەرێ

تەنیا، بایێ!

❖❖

## ( تلاش بی‌ثمر )

خُشک‌رود

رو بە دریا می‌بَرَد

تنها، باد!

## ( شەکەتی )

سەوزک نییم

ڤەرچە بایٚ نەیٚڤەریٚکەم؟!

❖❖

## ( خستگی )

سبز که نیستم

باد چرا مرا نمی‌بَرَد؟!

## ( نادیار )

دیر و نزیک،

نیمەکەیٚ نسار مۆنگە:

مەرگ

❖❖

## ( ناپیدا )

دور و نزدیک،

نیمه‌ی همیشه در سایه‌ی ماه است:

مرگ

## ( گەڵئاسارەیٚ پەژارە )

دڵێک لەرزا

هەزار هەزار ئاسارە داجڕیا

لە تەزبێیەکەیٚ مووڵەق

❖❖

## ( کهکشانِ غم )

دلی لرزید

هزار هزار ستاره فرو افتاد

از تسبیحِ آسمان

## ( گناتە )

پایٚ ئەقڵت چقیا دە خەڕە

مەر دەس دڵ دراریٚکەت!

❖❖

## ( بدشگونی )

پای عقل‌ات در گِل فرو ماند

مگر دستِ دل بیرون‌ات آورد!

## ( بێکەسی )

زەمدار و تەنیا

نە یەێ ساڵ، سەد ساڵ

نە یەێ کەس، یەێ گەل!

❖❖

## ( بی‌کسی )

زخمی و تنها

نه یک سال، صد سال

نه یک نفر، یک خلق!

## ( پێشگر )

سایەم، ئەفتاو نەێڤینێ

ئەفتاو، سایەم ـ

"م" چ دیڤار بەرزێکە!

❖❖

## ( حائل )

سایه‌ام، آفتاب نمی‌بیند

آفتاب، سایه‌ام را ـ

«من» چه دیوارِ بلندی‌ست!

## ( دەمتەقە )

دۆ ئەسکەملی

دۆ نێیەێ گەرم و دۆ دڵ پڕاپڕ ئەژ بەوش ــ

ڤە دەمتەقە، شێعر ڤەدی دێیاێ

❖❖

## ( گفتگو )

دو صندلی

دو نگاهِ گرم و دو قلبِ آکنده از شادی ــ

با گفتگو، شعر زاده می‌شود

## ( هەڵچین ڕەنجێگ! )

ـ ئەو برج بەرزە، وەچە تا ئەورەیل باڵا کردێیە؟

ـ وە باڵەیل ئشکیاێەێ هزاران خێیاڵ نامراێ.

❖❖

## ( قد کشیدن یک رنج! )

ـ آن بُرج بلند، چگونه تا ابرها قد کشیده؟

ـ با بال‌هایِ شکسته‌ی هزاران رؤیایِ ناکام.

## ( شارڤەدەرەل )

ئەژ ئی کتاو... ڤر ئەۆ کتاو

شارڤەدەرن تاهەیٚ ــ

ئسکەندەر و چەنگێز و هیتلر!

❖❖

## ( تبعیدیان )

از این کتاب... به آن کتاب

تا ابد تبعیدی‌اند ــ

اسکندر و چنگیز و هیتلر!

## ( چارەنویس )

"چارەنڤیس"ـیٚ نەیٚریٚم

بیٚجەژ، "سەرهات"ـمان!

❖❖

## ( تقدیر )

«سرنوشت»ی نداریم

جز، «سرگذشت»مان!

## ( دیر و نزیک )

هەم ئەڤ ئاسارەیٚ دیرەسەم

هەم ئی هیردڵە تووس نزیکە ـ

نە نزیکم و نە دیرا!

❖❖

## ( دور و نزدیک )

هم آن اخترِ دورم

هم این ذرّه غبارِ نزدیک ـ

نه نزدیکم و نه دور!

## ( دەمتەقە وەگەرد بایٚ )

"وەڵگەیل، وشەیل ڕووژانەمن

هەڵبەس پایٚارم ها لە ڕەگ و ڕیشە"

... وە وا وتم!

❖❖

## ( گفتگو با باد )

«برگ‌ها، کلمات روزانه‌ی من‌اند

شعرِ ماندگارم اما در ریشه‌هاست»

... به باد گفتم!

## ( ئاکام )

ـ یەیش ئەژ دمایین سەنگەر:

خوەم دە وەراوەر خوەم!

ـ کێ سەرکەفتەێ مەیْدانە؟

❖❖

## ( سرانجامِ کار )

ـ این‌هم از آخرین سنگر:

خودم در برابرِ خودم!

ـ پیروزِ میدان کیست؟

## ( بقە )

"تەنیایی"، گورگ دێرێ

وریا بە!

❖❖

## ( خطر )

«تنهایی»، گُرگ دارد

مواظب باش!

## ( ئاواخت بەردین )

ـ بای! بەرەم تا ئەوپەڕ دنیا

ـ دەرم... ئەژ بەرگ بەردینت درا

❖❖

## ( سنگینه آرزو )

ـ ای باد! تا آن سرِ دنیا ببر مرا

ـ می‌بَرَم... از جامه‌ی سنگی‌ات بیرون بیا

## ( پەرتووک لاڵ )

ژە تاسەم ئەونەیڕەسی...

ئەڵگەردیایەی دەنگ دڵم لە دنیاکەت

تەنیا بێدەنگییە

❖❖

## ( کتابِ لال )

اشتیاقم را درنمی‌یابی...

ترجمه‌ی آوایِ قلبم در جهان‌ات

تنها سکوت است

## ( ئەڕا؟! )

تا چنمەت

دی ڕەنگینەکەیٚ جاران نیید

ئەڕا؟!

❖❖

## ( چرا؟! )

تا می‌چینمات

دیگر آن زیبایِ همیشگی نیستی

چرا؟!

## ( هیرۆگلیف )

تەنیا، ئەڤین تۆەنیٚ

هیرۆگلیف دەسەیلمان بخوەنیٚ!

❖❖

## ( هیروگلیف )

تنها، عشق می‌تواند

هیروگلیفِ دست‌هایمان را بخواند!

## ( هەناسەیٚ سەرد )

ـ ئی کاخ ڕەنگین و گەپە، ملاتیٚ چەو؟

ـ ئاهـ !... هەناسەیٚ سەرد کارکەرەیل.

❖❖

## ( آهِ سرد )

ـ این کاخِ زیبا و عظیم، ملاطش چیست؟

ـ آه!... آهِ سردِ کارگرها.

## ( ڕووژ و مۆنگ و ساڵ )

ڕووژەل هەفتە ئژماری

ناو دنی ئەڵ مۆنگەل و

ساڵەل ئەژ کیست دچن!

❖❖

## ( روز و ماه و سال )

روزهای هفته را می‌شماری

نام بر ماه‌ها می‌گذاری و

سال‌ها از کفَت می‌روند!

## ( دوونادوون )

**سۆرەگوڵ، دوونادوون کوم ئاوەختە؟!**

❖❖

## ( تناسخ )

**گُل‌سرخ، تناسخِ کدام آرزوست؟!**

## ( دارڕمیان )

**ـ ڕووسەمی یا سۆراو؟**

**ـ چ فەرخێ کەرێ؟!... ڤڵاتێ خەڵتان ڤە خین بی**

❖❖

## ( ویرانی )

**ـ رستمی یا سهراب؟**

**ـ چه تفاوت دارد؟!... سرزمینی غرقه به خون شد**

## ( گووشگر )

هادەیٚ تەنیا پەپیەل

دەنگ پیانۆژەنین گولەل بژنەڤن!

❖❖

## ( شنونده )

شاید تنها پروانەها

نوای پیانوزدنِ گُل‌ها را بشنوند!

## ( پیٚشهاتیٚ دە بایٚبایٚەڕووە )

گورڕگوەڕ بایٚەڕووە...

بڕیار دایٚە ک بمینیٚ

پەڕە گیایٚ نازکیٚ

❖❖

## ( حادثه‌ای در توفان )

غرّشِ باد و باران...

عزم کرده تا بماند

یک پَرِ نازکِ علف

## ( چەڤنیقەنە دخۆنم )

ئی سۆرەگوڵەیش کتاوێکە

ڤە وشەیلێ ئەژ بووا!

❖❖

## ( چشم‌بسته می‌خوانم )

این گُل‌سرخ هم کتابی‌ست

با واژه‌هایی از جنسِ بو!

## ( ژە بەیان تا وایێ ئێوارە )

گوڵ سۆ، ڤهارمەڤ

سەرئێڤارە، پاییزم...

وەرزەلم چەنێ کوڵن!

❖❖

## ( از بامداد تا عصرگاه )

سپیده‌دم، بهارم است و

عصر، پاییزم...

فصل‌هایم چه کوتاه‌اند!

## ( بەرخوەدان )

دە سەردەم ئمپراتووریی ئەسر

بژی بەرخوەدان زەردەخەنە!

❖❖

## ( مقاومت )

در عصرِ امپراطوریِ اشک

زنده‌باد مقاومتِ لبخند!

## ( کزە )

کزەبایٚ

لاوەلاوەو یا مووە

دە گووش دار؟

❖❖

## ( نسیم ـ آواز )

نسیمِ خزان

لالاییست یا مویه

در گوشِ درخت؟

## ( داکەفتن )

باڵنەیٚ بیچک

وە بیٚ‌تاشا نیشت

داووڵ کەفت!

❖❖

## ( سقوط )

پرندەی کوچک

بی واهمه و ترس نشست

مترسک افتاد!

## ( وڵات بایٚ )

وەڕاس، کیٚ ئاڵایٚ وڵات بایٚ شەکەن؟!

❖❖

## ( سرزمینِ باد )

راستی، پرچمِ سرزمینِ باد را که به اهتزاز درآورد؟!

## ( بێدەنگی )

بێدەنگی، تاریکی نییە

بێدەنگی، کاکێشۆنێ پڕ ئەژ ئاسارەل بێناوە!

❖❖

## ( سکوت )

سکوت، تاریکی نیست

سکوت، کهکشانی پُر از ستاره‌هایِ بی‌نام است!

## ( کزەبا )

کزەبا، چە نا بن گووش دارەل

ک ڕەنگڕیيۆ ئەڵگەردیا؟!

❖❖

## ( نسیمِ پاییزی )

نسیمِ پاییزی، چه در گوشِ درختان پچپچ کرد

که رنگِ چهره‌شان دگرگون شد؟!

## ( نامه )

بایْ، نامەیْکه

هەرگز نەیْرەسیْیه مزلْ!

❖❖

## ( نامه )

باد، نامه‌ای‌ست

هرگز به مقصد نمی‌رسد!

## ( گوورانی )

ـ ئەژ ناو گوورانییەل، کومۆ ڕەنگینترینه؟

ـ بیْدەنگی... هەنیْ ڤە ئشق، تەماشایْ دنیا کەری.

❖❖

## ( ترانه )

ـ از میان ترانه‌ها، کدام یک زیباترین است؟

ـ سکوت... وقتی با عشق، به تماشاِی جهان نشسته‌ای.

## ( وتووێژ )

چۆ لە زوان یەکتر ئەوڕەسن

زەلان و بایْ شەماڵ؟!

❖❖

## ( گَپ )

زبانِ یکدیگر را چگونه می‌فهمند

باد جنوب و باد شُمال؟!

## ( سەرئاسۆ )

ئەر بەرز و سەرئاسۆ بووم

تۆ ڤهارێک ئێقە دیری

ک هەمیشە تەڵوەنەم دە بەرف!

❖❖

## ( قلّه )

اگر قلّه باشم و بلند

تو بهاری چنان دوری

که همیشه غرقه‌ام به برف!

## ( چراێ خەنسن )

سەد ساڵ تەریک، گرێڤسی

یەێ گلیش، چراێ خەنسنێ بگریسن!

❖❖

## ( چراغِ خنده )

صد سالِ تاریک، گریه کردی

یک بار هم، چراغِ خنده‌ای بیفروز!

## ( ئەڤرەل )

ئەرێ ئەڤرەل، خەوەل زەمینن

یا ئاوەختەلێ

ک پەیتاپەیتا شێوە گوەڕنن؟!

❖❖

## ( ابرها )

ابرها، خواب‌هایِ زمین‌اند آیا

یا آرزوهایش

که مدام تغییرِ چهره می‌دهند؟!

## ( زۆن زنه )

زنەترین زۆن دنیا

هۆچ وشەێ نەێرێ:

زۆن ئەسر و لەۆەخەنه!

❖❖

## ( زبان زنده )

زندەترین زبانِ دنیا

هیچ واژەای ندارد:

زبانِ اشک و لبخند!

## ( دمایین ئاساره )

ئەۆلاێ دمایین ئاساره، کێ ژییێ؟

مەل ناهروو تەریکی یا دەلیاێ بێ‌لێوار بێ‌دەنگی؟!

❖❖

## ( آخرین ستاره )

فراسویِ آخرین ستاره، که می‌زید؟

پرنده‌ی اُنس‌ناپذیر و گریزانِ تاریکی یا دریایِ بی‌کرانه‌ی سکوت؟!

## ( خەوەژی )

مۆنگ چواردە...

ئای! ئەژ خەو ئەڵوارڕکیاینە

گوڵ بەرەفتاو؟!

❖❖

## ( آشفته‌خواب )

ماهِ تمام...

آه! از خواب پریده‌ای

گُل آفتابگردان؟!

## ( چراخ )

ڤەر مردەلە

یا ڤەر زنەل

چراخ ئەڵگرسیایێەیٚ ناو گووڕسۆ؟!

❖❖

## ( چراغ )

برای مُرده‌هاست

یا زنده‌ها

چراغِ افروخته در گورستان؟!

## ( چەم )

چەم، ڕازانەێکە

بەێتئەڵوەسەکەێ، کانی

❖❖

## ( رود )

رود، تک بیتِ زیبایی‌ست

سُراینده‌اش، چشمه

## ( بەختەڤەری )

ـ ئەژ کوم لا ئڵایێ بەختەڤەری؟

ـ ئەژ ئەۊ لایێ ک چەمەڕا نیید.

❖❖

## ( خوشبختی )

ـ از کدامین سمت برمی‌دَمَد خوشبختی؟

ـ از آن سمتی که انتظار نداری.

## ( دما لاپەڕە )

مەرگ، خوەنن دما لاپەڕەیٚ کتاوێکە

تا دەس بکەرییە خوەنن کتاویٚ ترا!

❖❖

## ( آخرین صفحه )

مرگ، خواندنِ آخرین صفحه‌ی کتابی‌ست

تا خواندنِ کتاب دیگری را بیاغازی!

## ( تۆم )

چە گۆوار کرد ئەڵ یەکمین تۆم

ک باڵا کرد ئەژ قیلی ڤەرەق ڕووژنا؟!

❖❖

## ( بذر )

چه الهام شد به اولین بذر

که قد کشید از ژرفنا به سمتِ روشنا؟!

## ( خوەنستن )

خۆنمەیٚ

بیٚ هۆچ کرٍ و نیسەنەیٚ،

بەیٚبوونیٚک ئسپیٚ

❖❖

## ( خواندن )

می‌خوانم‌اش

بی هیچ خط و نوشته‌ای،

بابونه‌ای سفید

## ( بۆەش )

ڤە چەن وشەیٚ ڕەنگ و بوو و درٍک

چ بۆەش نازاریٚکە گولٚ!

❖❖

## ( شاعر )

با چند واژه‌ی رنگ و بو و خار

چه شاعرِ نازنینی‌ست گُل!

## ( هەر ئازەی پلۆمژکیا! )

پژک ئسپێ

م ئاهـ ئەڵنەکێشیاێە، پلۆمژیا ــ

دۆنێ بەرف بی!

❖❖

## ( به همین زودی پژمُرد! )

شکوفەی سفید

من آه نکشیده، پژمرد ــ

دانه برفی بود!

## ( زاڕوویی )

ئەڵ پەل دارەکە

چەن زەردەبەی، چەڤەڕێین

باڵا بکەرێ زاڕوویيم

❖❖

## ( دوران کودکی )

بر شاخەی درخت

چند بهِ رسیدەی زرد، منتظرند

قد بکشد کودکی‌ام

## ( ململانێ )

هەن قەتار بەسان

بایەگێژەیش دە ڤەراوەرۆ کپێ ـ

گوڵەیل کۆستان

❖❖

## ( هماوردی )

هنگامِ صف‌آرایی

گردباد هم در برابرشان آرام می‌گیرد ـ

گُل‌های کوهستان

## ( بەێداخ خین )

بەێداخ خین ئەڵدایە

نە گەرد ئاسمۆ چنە دێ، نە زەمی

تەێل دڕکدار

❖❖

## ( پرچم خون )

پرچمِ خون افراشته

نه با آسمان حرف می‌زند، نه زمین

سیمِ خاردار

## ( لیکە )

چەن بەڵگ دار، ڤە هناسەیٚ سەردم ڕزیا؟!

چەن گول گەنم، ڤە زەردەخەنەم جیک دا؟!

❖❖

## ( جوانەی گندم )

چند برگِ درخت، با آهِ سردم فرو ریخت؟!

چند خوشه گندم، با نوشخندم جوانه زد؟!

## ( پەپی سۆرە )

ناهەڵمۆنە شێڤیا

بیٚدەنگییەکەیٚ هۆـ تلیٚ:

پەپی سۆرەیٚ نیشت

❖❖

## ( پروانەی سُرخ )

ناگهان برهم خورد

سکوتِ صخرەای بزرگ:

پروانەی سُرخی نشست

## ( چیرووک خەمبارانە )

دڵێ ئشکیا؛

بایێ ئەڵکرد و

ئاسارە جڕیا

❖❖

## ( داستان غم‌آلود )

دلی شکست؛

باد وزیدن گرفت و

ستاره درگذشت

## ( فرەزۆنا )

ئەوڕەسیم ک نەێزۆنم؛

ئێمکە نزیک‌تر بیمە ڤەت

فرەزۆنای گەپ

❖❖

## ( فرزانه )

دریافتم نمی‌دانم؛

اکنون به تو نزدیک‌تر شده‌ام

فرزانه‌ی بزرگ

## ( ڤیٚ لیٚڤە )

ناو یە "ڤیٚ" و ئەڤەیٚتریش "ڤارۆ"

ناوت چەو "ڤیٚیەکەیٚ ڤاو شووڕکردەیٚ ژیٚر ڤارۆ"؟

❖❖

## ( بید مجنون )

نام این «بید» و آن دیگری «باران»

چیست نامات «بیدِ گیسو فروهشتەی زیرِ باران»؟

## ( گومبییە )

جایٚ تر منەی نەکە؛

ئەر دە ناخ دلٚت نەدینەیٚ

ئەڤدی نیٚیەو دەیٚ

❖❖

## ( گمشده )

نگرد جایِ دیگری را؛

درون قلبِ خود ندیدی‌اش اگر

پیدا نمی‌شود دیگر

## ( ئاواختەل )

**ئاواختەل**

**وەچە ڕێ کەرنەڤ دی**

**دە تەریکی؟!**

❖❖

## ( آرزوها )

**آرزوها**

**راه را چگونه می‌یابند**

**در تاریکا؟!**

## ( یەکلّەدار و دارسان )

**یەکلّەدارێ، پا دایە گەز دە وەراوەر تووفان**

**دارسانێ، مل خوەێ چەمانێیە ئەڕا تەوەرا!**

❖❖

## ( تک‌درخت و جنگل )

**تک‌درختی، ایستاده در مقابلِ توفان**

**جنگلی، خم نموده گردن‌اش برابرِ تبر!**

## ( هەلوورک )

گرمەیْ تووپ و تانک...

هەلوورکیْ لە چوو ئەرخەوان تەڕ

ئێرنگە تەرم سوور یەیْ کوورپە

❖❖

## ( گهواره )

صدای توپ و تانک...

گهوارەای از چوب ارغوانِ تازه

اکنون تابوت سُرخِ یک نوزاد

## ( ناو )

هزار ڕەنگ و

یەیْ ناو:

بەڵگەل پایزی

❖❖

## ( نام )

هزار رنگ و

یک نام:

برگ‌های پاییزی

## ( قڕ )

خین هزار دار

ڕشیاێە دە لار یەیٚ پەڕە قاقەز

❖❖

## ( مرگ جمعی )

خونِ هزار درخت

ریخته در تنِ یک برگ کاغذ

## ( پاییز پڵە )

پاییز پڵە...

قیلتر ئەژ دەروەنەیل بیٚبن

پەژارەیٚ کووچبار

❖❖

## ( باران پاییزی )

بارانِ پاییزی...

ژرفتر از درّەهای بی‌انتها

اندوهِ کوچ

## ( تەنیای )

شەو بەرفین...

هوچ ڕێوارێ دیار نییە

بێجەژ من و مۆنگ

❖❖

## ( تنهایی )

شبِ برفی...

هیچ رهگذری پیدا نیست

جز من و ماه

## ( ویرووشە )

دمایێ ڤارۆ

بووخوەش ئەزبووە کوّیی ـــ

ئەی! زاڕوویيم گلئاورد

❖❖

## ( یاد پُر تب‌وتاب )

پس از باران

عطرِ خوشِ آویشنِ کوهی ـ

آه! کودکی‌ام بازگشت

## ( مەتەڵ )

لیلەی گورگ:

تەنیا مۆنگ دیارەو

تەنیایی

❖❖

## ( حکایت )

زوزەی گُرگ:

تنها ماه به دیده می‌آید و

تنهایی

## ( هڕبکیش )

ئەی بای!

دەس ئەڵگر ئەژ پەڕەی گوڵ

بەردێ ژە جاکەی ئەڵکەن

❖❖

## ( رجزخوانی )

ای باد!

از برگ گُل دست بردار

سنگی ز جای برکَن

## ( مەلیچک زەردە )

مەلیچک زەردەی

باڵ گریٚ، نیشێ ئەڵسەر دڵم

پەژارەی

❖❖

## ( گنجشکِ زرد )

گنجشکی زرد

می‌پرد، می‌نشیند روی دلم

اندوهی

## ( ڕێ )

ڕێی دیریٚ...

ڤە سەر خوەی ڕاموٚ دنیٚ

ڕەنج

❖❖

## ( راه )

راهی دور...

صبورانه یادمان می‌دهد

رنج

## ( ڕۆمان )

هەر تاڵ میی ئسپێ

کرێ ئەژ ڕۆمان نەنیسیاێەێ ـ

نەنک!

❖❖

## ( رُمان )

هر تار موی سپید

خطی از رُمانِ نانوشته‌ای ـ

مادربزرگ!

## ( پەنابەر )

ئەژ گاڵەگاڵ

پەنا ئاوردمەڤ هەڵبەس ـ

ئەژ خوەم ڤە کوو پەنا بەرم؟

❖❖

## ( پناهنده )

از هیاهو

پناه آورده‌ام به شعر ـ

از خود به کجا پناه جویم؟

## (دەنگدانەوە )

دەنگ سەێرە...

ئاخ! ئەگەر چیاێک بیاتام ئەڵ ڤەراوەرێ

منیش دچڕیم

❖❖

## ( پژواک )

آوازِ سُهره...

آه! اگر کوهی بودم مقابل‌اش

من هم می‌خواندم

## ( لێڵە )

لێڵەێ پایزە...

دە ئی سەردەم بێ زەردەخەنە

ئەڵکەفتێکە مۆنگ یەکشەڤە

❖❖

## ( شامگاه )

شامگاهِ پاییزی...

در این دورانِ بی‌لبخند

فرصت مغتنمی‌ست ماهِ نو

## ( ئەژ ناو تەم )

ڤیرمانێ دیر...

ئاخرێ سۆرەگوڵەل کردەۊ دی

پەرپریک ئەژ ناو تەم

❖❖

## ( از درون مِه )

خاطره‌ای دور...

گُل‌سرخ‌ها را عاقبت پیدا کرد

پروانه از درون مِه

## ( دڵنیایی )

تا مۆنگ نەچیمە؛

دڵنیام ئەمان ک دەۊرەیش

"تەنیایی" سەنگێ قورسە

❖❖

## ( یقین )

تا ماه نرفته‌ام؛

اما یقین دارم که آنجا هم

سنگین است وزنِ «تنهایی»

( بایٚ )

گژەگژ بایٚ...

چەن بەڵگ زەرد و سۆر ئاوردێیەۋ

ڤیرمۆنیٚ دیرا!

❖❖

( باد )

هوهویِ باد...

چند برگِ زرد و سرخ آورده و

خاطره‌ای دور!

( ئەزرەتمەن )

گوڵ کەڵمەس!

نەێڤەشی ک پایزەل

ئەزرەتمەن چەی؟

❖❖

( حسرت‌زده )

گُل حسرت!

نمی‌گویی که پاییزها

در حسرت چه‌ای؟

## ( شەڕ )

ئەڵ دەفتەرڤێنەیٚ زاروو

هاڵێم فڕووکە و تانک و تفەنگ ـ

شەڕیٚ ترەک هە ئەڵ ڕیٚ

❖❖

## ( جنگ )

بر دفتر نقّاشیِ کودک

هنوز هواپیما و تانک و تفنگ ـ

جنگِ دیگری در راه است

## ( قەپیٚ بەرف )

خاکەلێوە...

تەنیا قەپیٚ بەرف مەنێیە

ئەژەۊ هەمکە سەختییە

❖❖

## ( مُشتی برف )

اوایلِ بهار...

تنها مُشتی برف مانده

از آن‌همه دشواری

## ( دمایٚ کووچ )

شەڤەکینیٚ بیٚ بایٚ

کەفتێیە لەرە، لار ئسپێدار

دمایٚ کووچ پەلەوەرەیل

❖❖

## ( بعدِ کوچ )

صبحی بدون باد

به لرزه افتاده، تنِ سپیدار

بعدِ کوچِ پرندەها

## ( هیلە )

کەمەر ـ دەنگکەرە...

هیلەهیل مهۆنیٚ ئسپیٚ

ڤە پرتاف دێیایٚ

❖❖

## ( شیهه )

کوهِ آوازبرگردان...

شیهەی پیاپیِ مادیانی سپید

به تاخت می‌آید

## ( سەردەبایٚ )

تەنیا گڕیٚ بی

هەنیٚ سەردەبایٚ ئەڵکرد:

گرد ئەڤ سەرهاتە

❖❖

## ( بادِ خزانی )

لحظه‌ای بود تنها

وقتی بادِ خزانی وزید:

همه‌ی آن ماجرا

## ( تاریکەڵان )

چەن چرایٚ ترەک، گرەک بگریسنم

تا بۆیینم "وژ" دە تاریکستان "خوەم"؟

❖❖

## ( تاریکزار )

چند چراغِ دیگر می‌بایدم افروخت

تا ببینم «خویشتن» را به تاریکستانِ «خویش»؟

## ( خین ئەنار )

یەکڵە ئەنارێ

ئەڵ ژێر هرِشت پایزەێ ــ

دڵ تەنیاێ کێیە؟

❖❖

## ( خونِ انار )

تک اناری

زیرِ یک رگبارِ پاییزی ــ

دلِ تنهایِ کیست؟

## ( چووڵهووڵ )

دنیاێ چووڵهووڵ...

هەرلا دچم، عەترت ها دەوِرە

ئاخ! گوڵە نادیارەکە

❖❖

## ( تهی )

جهانِ خالی‌ازهرچیز...

هر سو می‌روم، عطرت آنجا

آه! گُلِ ناپیدا

## ( دیمەن )

دیمەن دڵفرێڤێ...

ئەێ چەم، نەڤووس ڤە فێرێ

ک مری!

❖❖

## ( منظره )

منظره‌ای بس دلفریب...

به تماشای آن بازنایست، ای رود

خواهی مُرد!

## ( ئاساره )

تریسکەێ ئاسارەێ؛

ڕووشن کەرێ ئێمکەم

یاد فره دیرێ

❖❖

## ( ستاره )

سوسویِ ستاره‌ای؛

روشنایی می‌بخشد به اکنونم

خاطره‌ای بس دور

## ( بێناو )

ـ ئێڤەیش ک نەڤن، بێناو ئەڵکەرێمن.

بایەل ڤتن

❖❖

## ( بی‌نام )

ـ شما هم که نباشید، بی‌نام می‌وزیم.

بادها گفتند

## ( پرس )

پرسەیٚ دۆتڵە؛

گژکەل زەردەخەنەیٚ کەفتنە

بەۆیلە پەڕوویینە

❖❖

## ( سوگواری )

مراسم عزایِ دخترک؛

دکمه‌هایِ لبخندش افتاده‌اند

عروسک پارچه‌ای

## ( دمایۆ مەرگ )

فێر کە...!

دمایۆ مەرگم، شکووفەیۆ

ئەڵسەر ڕێۆ

❖❖

## ( بعدِ مرگ )

نگاه کُن...!

بعدِ مرگم، یک شکوفه

بر سر راه

## ( سەرکەفتن )

بایەڕووە کپیا...

کلک سەرکەفتن بڵۆ کردنە

دۆ گول گیایۆ بتەۆ

❖❖

## ( پیروزی )

توفان از نَفَس افتاد...

انگشتِ پیروزی بلند کرده‌اند

دو شاخه علفِ استوار

## ( دمایین قسه )

کێ دمایین قسه کەرێ

ده وتووێژەکەێ ناون من و خوەم؟!

❖❖

## ( آخرین حرف )

آخرین حرف را چه کسی خواهد زد

در گفتگویِ میان من و خودم؟!

## ( خەم و تەم )

دما، خەم

نووایش تەم ــ

تەنیا دڵم ددی!

❖❖

## ( اندوه و مِه )

پشت سر، اندوه

پیش رو هم مِه ــ

تنها دلم می‌دید!

## ( شەش لا )

ـ گومبییەکەم هە کوورا؟!

ـ دەڤرە ک ئاگربەرەکەل، گیرساننە هەر شەش لا

❖❖

## ( شش جهت )

ـ گمشده‌ام کجاست؟!

ـ آنجا که شبتاب‌ها، افروخته‌اند هر شش جهت را

## ( دەسەل ئەسرین! )

وێنەکێش کارامە

زەردەخەنەیٚ گەل ڤەیٚ نەکێشیا

دەس ئەڵنا ڤە گرێڤە!

❖❖

## ( دستانِ اشک‌بار! )

نقّاشِ زبردست

لبخنده‌ی خلق را نتوانست کشید

گریه آغازید!

## ( هس! )

هس...!

ئەڵ ڕزگ دماین ئی هایکۆوە خەوسێیە

شاپەریکێ

❖❖

## ( هیس! )

هیس...!

بر سطرِ آخرِ این هایکو خوابیده

شاپرکی

## ( گوڵ هێروو )

هێروو ئەرخەڤانی...

تا ناخ گیۆنم ژێرڕوو کردم، نەڤی

هیچ، بێجەژ "ئاهـ !"

❖❖

## ( گُل خطمی )

خطمیِ ارغوانی...

تا عمق جانِ خود، کاویدم و نبود

هیچ، بەجز «آه!»

## ( ڕووسەم )

ڕووسەم نهاتگرته!

ڤڵگ پلکیایە دە خین سۆراو

چەۆ ئسپەنیارەکەێ تنە

❖❖

## ( رُستم )

رُستمِ شوربخت!

پهلویِ غلتیده در خونِ سُهراب

چشمِ اسفندیارِ توست

## ( ئاڵووزی )

دنیاێ ئاڵووز...

یە هەێ ئەۆ خێیاڵ ڕەنگینەسەو

دە ماڵزاروو دیمەێ؟!

❖❖

## ( آشوب )

جهانِ آشوب‌زده...

این همان رؤیایِ زیباست

در زهدان دیدماش؟!

## ( ڕەنگ )

ـ هۆهۆ کزەبایْ، وەگەرد ئی هەمکە ڕەنگ پایزە چە کەری؟

ـ تابلەو "تەنیاییەکەیْ گەپ" کێشم.

❖❖

## ( رنگ )

ـ آهای بادِ خزان، با این‌همه رنگِ پاییزی چه می‌کنی؟

ـ تابلوی «تنهاییِ بزرگ» را می‌کشم.

## ( کەشتی )

ئەر ئشق، کەشتیڤانە

کەشتییی توووفانەکەیْ خوەت بوو

❖❖

## ( کِشتی )

اگر عشق، ناخُداست

کشتیِ توفانِ خویش باش

## ( ماڵەکەیٚ دووس )

ـ کووە مەچین، ڤەی تەورە بیٚ ئاگر و چرا؟!

ـ دۆرتر ئەژ وژ... ماڵەکەیٚ دووس... نادیارا.

❖❖

## ( خانەی دوست )

ـ به کجا می‌روی، اینچنین بدون آتش و چراغ؟!

ـ دورتر از خویش... خانەی دوست... به ناکجا.

## ( ناونیشان )

ستار، ناو ڤلاتیٚکە

ڤەۆلایٚ خاس و خراو

❖❖

## ( نشانی )

آرامش، نامِ سرزمینی‌ست

فراسویِ نیک و بد

## ( ساووڵ )

ـ ئەڤ ساووڵ سامدارە کێیە؟

ـ سایٚ من بیٚخوەم.

❖❖

## ( شبح )

ـ آن شبحِ سهمناک، کیست؟

ـ سایەی منِ بی‌خویش.

## ( ئەسر )

گوورەمێی دەسچنیٚ

ئەژ دایٚاپیرەیٚ فرووشیاریٚ سینم ـــ

ئەڵ بەنەلەیٚ، چەنیٚ ئەسر؟

❖❖

## ( اشک )

جورابی دست‌باف

از پیرزنی فروشنده می‌خرم ـــ

بر نخ‌هاش، چند قطره اشک؟

## ( هووفەیٚ بایٚ )

ئاخ! گوڵدەمەل...

ک بایٚ دەس کردە هووفە، زۆنسم

ئەڤەیٚ گرەک

❖❖

## ( آوای باد )

آه! شکوفەها...

تا باد هوهو آغازید، دانستم

هرآنچه می‌بایست

## ( هۆچ )

حەح! چ گەپە

ئەۆ "هۆچ"ـە، ک دنیا

ئەژەیٚ سازیا

❖❖

## ( هیچ )

وه! چه عظیم است

آن «هیچ»، که عالَم

از آن ساخته شد

## (ماڵبار )

بار کردن

بەڵگ و پەلەڤەرەل، ئەژی ڤەرزە

بایۆ مەنێیە... تەنیا بایۆ

❖❖

## ( کوچ )

کوچیدند

برگ‌ها و پرنده‌ها، از این فصل

باد مانده... تنها باد

## ( پلوور )

گووشم ڤە پلوور؛

ها بلوورەکەێ مەژەنێ ئیسە

دووارە ڤاران

❖❖

## ( ناودان )

گوشم به ناودان؛

دارد نی‌لبکش را می‌نوازد اکنون

دوباره باران

## ( سۆرەگوڵ )

ئاگادارم کە

ئەژ هەڤاڵەل دە ژێر خاک خەویایە،

سۆرەگوڵەکە!

❖❖

## ( گُل‌سرخ )

خبرم کُن

از رفقایِ به زیرِ خاک خُفته

ای گُل‌سرخ!

## ( هەواڵ )

شووڕشێ هە ئەڵ ڕێ:

دخوازێ بووە ئەۆر تەڕێ

کەنیلک

❖❖

## ( خبر )

انقلابی در راه است:

می‌خواهد ابرِ باران‌زایی شود

چشمەی کوچک

## ( ڤەرچە )

ڤەرچە پەژارەل

پایزەل گوڵ کەرن؟!

❖❖

## ( چرا )

چرا غم‌ها

پاییزها شکوفه می‌کنند؟!

## ( دمایۆ چەن ساڵ دیری )

ـ "بێ بەرف، نەژناسیمەت!"

ڤتمە کەوِر کۆ

❖❖

## ( پس از چند سال دوری )

ـ «بی برف، نشناختمات!»

گفتم به کبیرکوه

## ( پشمە )

پشمەیٚ لاسار؛

ئەڵ کووڵەکەیٚ کووشک دیٚرین

تلیشیٚ ترا!

❖❖

## ( عطسه )

عطسه‌ی دیکتاتور؛

بر ستونِ قصرِ قدیمی

شکافی دیگر!

## ( یەکڵەدار )

یەکڵەداریٚ

خەمبار ئەژ دیریی ڤارۆ

تابووت خوەیٚە!

❖❖

## ( تک‌درخت )

تک‌درختی

غم‌زده از دوریِ باران

تابوتِ خویش است!

## ( شاپەریک )

شاپەریک!

بنیشنەم ئەڵسەر باڵت و بەرەم

تا ڕووژنای

❖❖

## ( شاپرک )

شاپرک!

بر بال خود بنشان مرا، ببر

تا روشنایی

## ( هاڵێ )

دما پرتەێ چرا...

هاڵێ ڕێیەکەم ڕووشن کەرێ

ڤیرێ

❖❖

## ( هنوز )

پت‌پتِ آخرِ چراغ...

هنوز راهم را روشن می‌کند

یادش

## ( پەڵنگ )

مۆنگەکە!

نەچی ئەڤ نوواتر هۆ! ــ

پەڵنگێ کوڵ گرتێیە

❖❖

## ( پلنگ )

ای ماه!

جلوتر نروی ها! ــ

پلنگی کمین کرده

## ( تا چکەڵی )

تا بەرف ئاکوو

ڤە دڵەڤ مێیا بچین

یا چ کارەو؟!

❖❖

## ( تا ستیغِ کوه )

تا برفِ قلّه

باید که با دل رفت

یا چەکاره است؟!

## ( کاڵە )

شیپەیێ کاڵە

دا ئەوۆدەر ئەژ ناو تەم ـــ

ڤیرمۆنێ دیر

❖❖

## ( اسبِ سیاه )

شیهەی اسبِ سیاه

از درون مِه بیرون زد ـــ

خاطره‌ای دور

## ( کەێ؟ )

کەێ کپێ

ئی بایە ک دەرێکەم ئگەرد خوەێ

ڤەرز ڤە ڤەرز؟

❖❖

## ( چه وقت؟ )

چه وقت آرام می‌گیرد

این بادی که با خود می‌بَرَد مرا

فصل به فصل؟

## ( تەنیاییم )

"تەنیایی"یم

نیمەچڵنگ نییە تاهەێ ــ

گڵ‌گلیش مۆنگ پڕە

❖❖

## ( تنهایی‌ام )

«تنهایی»ام

همواره ناقص نیست ــ

گهگاه هم ماهِ کامل است

## ( ئەر )

بەرزەهەوایلە؛

ئەر باێ کەمێ تن‌تر ئەڵکردا

دڕەسەنەم ڤە مانگ

❖❖

## ( اگر )

بادبادک نخی؛

اگر کمی تندتر می‌وزید باد

مرا به ماه می‌رساند

## ( ناپاک )

تەڤەرێ

ڤە زەڤەرد ئەڵ دارێ دا ـ

ماچ یەهوودا

❖❖

## ( خیانت‌پیشه )

تبری

بر درختی زد محکم ـ

بوسه‌ی یهودا

## ( ڕێگەێ دیر )

هاڕەێ گڵاڵ:

ڕێڤارەل ڕێگەێ دیر

پا ئەڵگرن!

❖❖

## ( راه دور )

غریوِ رود:

مسافرانِ راه دور

بشتابید!

## ( هەرِەشە )

ـ کام وەرزا زووردارترە؟

ـ پەژارە!

❖❖

## ( تهدید )

ـ کدام ورزا، پُرزورتر است؟

ـ اندوه!

## (بڵێزە)

بڵێزەیٚ ئەڵەق دیرە

دە ژێر ڤارۆ، سەیلیٚ کەرم

چەنە دڵگەرمییٚ

❖❖

## ( شعله )

شعله‌ای در دوردست

زیر باران، نگاهش می‌کنم

به‌قدرِ دلگرمی‌ای

## ( پاشمەنە )

کووچ پایزە...

خەمبارترین پاشمەنە

ئەنار زەمدارێ

❖❖

## ( بازمانده )

کوچِ پاییزی...

غمگین‌ترین بازمانده

اناری زخمی

## ( قڕان )

ـ ئڕا وا هشک دە خۆنە؟!

ـ لە وڵات ئاوەختەیل ئیمە وێیەرد.

❖❖

## ( کُشتار جمعی )

ـ چرا باد آغشته به خون است؟!

ـ از سرزمین آرزوهایِ ما گذشت.

## ( ئاواز ئەڤین )

دونیا، دڵ گەپێکە

هەر یەک ئەژ ئێمە، ڕپەێ

❖❖

## ( آوازِ عشق )

دلِ عظیمی‌ست، جهان

هر یک از ما، تپشی

## ( دیرتر و نزیک‌تر )

هەرچێ ئەژ "م" دیرتر کەفم،

ڤە "خوەم" نزیک‌ترم!

❖❖

## ( دورتر و نزدیک‌تر )

هرچه دورتر می‌شوم از «من»،

به «خود» نزدیک‌ترم!

## ( ده بن تەریکی )

بلۆچەیێ...

خوەم گرێ کردمەڤ دی

ده بن تەریکی

❖❖

## ( در عمقِ تاریکی )

آذرخشی...

خود را دَمی پیدا نمودم

در عمقِ تاریکی

## ( ژین )

ژین، پرتووکێکه

ڤه پێنڤیس ڕەنج دنیسێ

❖❖

## ( زندگی )

زندگی، کتابی‌ست

با قلمِ رنج نوشته می‌شود

## ( یایێ و بایێ )

دنیا، بێ عەتر:

نە یایێ دێیایێ و

نە بایێ

❖❖

## ( یاد و باد )

جهان، بی‌عطر:

نه خاطره می‌آید و

نه باد

## ( گەردوون )

ئەڵ بەرزیی تەنیایی؛

ئێمکە گەردوون کوو بییە

دەی "ئاهـ"ـمە

❖❖

## ( عالَم )

بر بلندایِ تنهایی؛

جمع است کنون عالَم

در این «آه»ام

## ( پەژارەیٚ ئەوٚر )

خورەیٚ چەم

پاشمەنەیٚ پەژارەیٚ ئەوٚرە

یا تاسەیٚ دەریاو؟

❖❖

## ( اندوهِ ابر )

غریوِ رود

باقی‌ماندەی اندوهِ ابر است

یا شوقِ دریاست؟

## ( لاکیچە )

ـ ناو چووڵترین لاکیچە چەو؟

ـ ڤڵات گەپ بیٚدەنگی!

❖❖

## ( پس‌کوچە )

ـ نامِ خلوت‌ترین پس‌کوچە چیست؟

ـ سرزمینِ پهناورِ سکوت!

## ( دار سێف )

لەفاوێک خاپوورکەر...

ئەڵ پەل‌وپوو ئشکیایەیٚ دار سێفەکە

گوڵدەمەل، تەڕوتازە!

❖❖

## ( درختِ سیب )

سیلابی ویرانگر...

بر شاخسارِ شکستەی درختِ سیب

شکوفەها، تر و تازە!

## ( ئەسر و لەۊەخەنە )

ئەڵەق ئاسوو دیرە

نە ئەۊریٚ دیارە دەیٚ، نە مۆنگ ــ

ئای! ئەسر و لەۊەخەنەیٚ زیٚتر

❖❖

## ( اشک و لبخند )

در آن افقِ دور

نە ابری پیداست دیگر، نە ماە ــ

آە! اشک و لبخندِ گذشتەها

## ( سووسەن )

سووسەن گوڵێ

دەس دەرم و ئای! نەێچنمەێ

عەترەکەێ، زەردەخەنەێک

❖❖

## ( سوسن )

گُل سوسنی

دست می‌بَرَم و آه! نمی‌چینم‌اش

عطرش، لبخندی

## ( کوورا؟ )

بەرف ئەڵسەر بەرف

بێدەنگی ئەڵدم بێدەنگی ــ

ئەرێ هاێمنە کوورا؟!

❖❖

## ( کجا؟ )

برف روی برف

سکوت پشتِ سکوت ـ

کجا هستیم؟!

## ( ژین‌تیەڵی )

ـ بێ مانگ، شەو چ پەژارەیٚ بێ‌بنێکە!

ـ ئەریٚ... هەر زام "تەنیایی"، دارسان چڕێکە.

❖❖

## ( تلخکامی )

ـ بی ماه، شب چه بی‌انتها اندوهی‌ست!

ـ آری... هر زخمِ «تنهایی»، جنگلِ انبوهی‌ست.

## ( پەژارەیٚ جەهان )

ـ پەژارەیٚ جەهان ئەژ کوو دەس‌ئەڵنا؟

ـ ئووره ک خین سۊرەگوڵ ڕژیا.

❖❖

## ( اندوهِ جهان )

ـ اندوهِ جهان از کجا آغاز گردید؟

ـ آنجا که خونِ گُل‌سرخ ریخت.

## ( ئافرێنەر )

ئەڤی ئافرێنەر و

ئێمە باڵڤەسەیٚ ئازاد ئەڤ:

کات

❖❖

## ( آفریننده )

او آفریننده و

ما کَت‌بستەی آزادِ وی:

زمان

## ( کزەیٚ ڤا )

کزەیٚ ڤا دیم

هەنیٚ ها دگواریا ئەژ

دەرڤەن ئەرخەڤان

❖❖

## ( نغمەی باد )

نغمەی باد را دیدم

وقتی عبور می‌کرد از

درّەی ارغوان‌ها

## ( بایٚ شەماڵ )

دووڵ مینڕێژ...

مل ڕێیەکەیٚ هەل کەریٚ

بایٚ شەماڵ

❖❖

## ( باد شُمال )

درّەی مین‌ها...

راهِ خود کج می‌کند

باد شُمال

## ( قازقوڵنگ )

کەژیٚ تەماوی...

ئگەرد دەسەیٚ قازقوڵنگەل

باڵەق گریٚ "ئاهـ !"

❖❖

## ( دُرنا )

کوهی مه‌آلود...

همراه دسته‌ی دُرناها

پَر می‌گیرد «آه!»

## ( پەپی )

پەپییەکە چی

مەنێیە، دە بووخوەش مێخەکەلە

هاڵێ نەرمیی باڵێ

❖❖

## ( پروانه )

پروانه رفت

مانده، در عطرِ میخک‌ها

هنوز نرمیِ بال‌اش

## ( پیرەدار )

پیرەدار

تاق و تەنیا، دە لێڤار کەن قیلێ ــ

بایٚ دما همرِازێیه

❖❖

## ( درختِ پیر )

درختِ پیر

تک‌وتنها، بر لبه‌ی پرتگاهی ژرف ــ

آخرین همدم‌اش باد است

## ( پەلەڕێ )

ئەڤگرتن ڕفت ڤهار؛

ئەژ هزار پەلەڕێی بریقەکەر

چرێکەم بنار

❖❖

## ( کورەراه )

بندآمدنِ رگبارِ بهاری؛

از هزار کورەراهِ تابناک

صدایم می‌زند کوه

## ( کپووکرەک )

کووکووکەرە و کۆ

ڕیڤەڕی یەکتر: کوو، کوو... کوو، کوو

ئەژ یەک چە دپرسن؟!

❖❖

## ( فاختە )

کوه و کوکو

روبەروی هم: کو، کو... کو، کو

از هم چە می‌پرسند؟!

## ( خێیاڵ )

خێیاڵێک مناڵ،

دەی سەردەم شلووقە

دەسێ ڤەرد نەێم

❖❖

## ( رؤیا )

رؤیایی خُردسال،

رها نمی‌کنم دست‌اش

در این دورانِ شلوغ

## ( شەڤ )

"شەڤ"، سایێ کێیە؟!

❖❖

## ( شب )

«شب»، سایەی کیست؟!

## ( ئازیەتبار )

ـ کەلەوایٚ گوڵۆشکن ئەڕا نات؟!

ـ ئازیەتبار باڵنەیل کووچەرن هێمان، دارسان و ئاسمان.

❖❖

## ( سوگوار )

ـ چرا بادِ شکوفانندەی گُل‌ها نیامد؟!

ـ سوگوارِ پرندەهایِ مهاجرند، جنگل و آسمان هنوز.

## ( پەلام )

ئەژ هێرش دژمن

پەنا بەرمەۋ سەنگەر ـــ

ئەژ خوەم ڤە کوورا؟

❖❖

## ( هجوم / پناه )

از هجوم دشمن

پناه به سنگر ببرم ـ

از خود به کجا؟

## ( زامدار )

شاپەریکێ زامدار...

تاریکەشەو دڵخوەش دچم

تا ڕووژنای، ئەڵس‌بڕم

❖❖

## ( زخمی )

شاپرکی زخمی...

شادمانه می‌روم شبِ تاریک

تا روشنایی، افتان‌وخیزان

## ( دما پێچ )

ئەڵ دما پێچ ئاهەڕا

مردنیش ڤە هناسەبڕکێ مەنە جا

ئەژ کاروان گەریلا

❖❖

## ( پیچِ آخر )

بر پیچِ آخرِ کوره‌راه

مرگ هم نَفَس‌زنان جا ماند

از قافله‌ی گریلا

## ( تفەنگ )

ئەژ جاسووسەیٚ تفەنگ

گوت کردنە ئەڵ بنار قەندیل،

سەربازەل شەکەت

❖❖

## ( تفنگ )

از مگسکِ تفنگ

به بلندایِ کوهِ قندیل خیره گشته‌اند،

سربازهایِ خسته

## ( ئەڵسیایٚن )

ئگەرد شنۆ ئەڵسن

گژ و گیایلیٚ ک چەمیاوین

دە ژیٚر چەکمەیٚ سەرباز

❖❖

## ( خیزش )

با نسیم برمی‌خیزند

علف‌هایی که خمیده بودند

زیرِ چکمەی سرباز

## ( تیلەڕێ )

تاکەگلێ مۆنگ

ملەتەتکی کەرێ ئەژ ناو تەم ـــ

پەڕ تیلەڕێیەکە، مینڕێژ

❖❖

## ( باریکەراه )

گهگاهی ماه

سرک‌کِشان از میان مِه به تماشا ـ

مین‌ها، کنارِ باریکەراه

## ( سەدەێ جەنگ )

کڕکەڕ زەنجیر تانک ـــ

مردەیلیش دە بن خاک

خەوەژی بینە!

❖❖

## ( قرنِ جنگ )

صدای شنیِ تانک ـ

مُردەها هم در قعرِ خاک

بی‌خواب گشته‌اند!

## ( بوو باروووت )

مێیا چەن ساڵ بڤارێ

تا بوو باروووت ئەژەێ بسڕێ

ڕووژهەڵات ناوڕاس؟

❖❖

## ( بوی باروت )

چند سال باید ببارد

تا بویِ باروت‌اش پاک شود

خاورمیانه؟

## ( بەندیخانە )

قازقوڵنگەل

کل دوون ئەژ ئاسمۆن بەندیخانە

ئگەرد هناسەێ سەرد دیلێ

❖❖

## ( زندان )

دُرناها

از آسمانِ زندان می‌گذرند

همراه آهِ سردِ یک اسیر

## ( تاوان )

بایێ: "ئی هەمکە ڕەنگ پایزە، تاوانەل منن؟"

بەڵگ: "نە!... بێتاوانیی منن."

❖❖

## ( گناه )

باد: «این‌همه رنگ‌هایِ پاییزی، گناهانِ من‌اند؟»

برگ: «نه!... بی‌گناهیِ من‌اند.»

## ( مزگانا )

هەن پایزەپڵە؛

کێ ڤە گیا مزگانا دا

ک نووڤهارە؟!

❖❖

## ( مژده )

موسمِ باران پاییزی؛

چه کسی مژده داد علف را

که نوبهار است؟!

## ( هەناز )

ـ ماڵەکەیْ "هەرمان" هە کوو؟

ـ گرِیْ هەناس ئازاد

❖❖

## ( سمت‌وسو )

ـ خانەی «جاودانگی» کجاست؟

ـ یک‌دَم نَفَسِ آزاد

## ( ئەوانەیْ ک دە وەراوەر مەرگ وسان )

وتن "نە!" و

لە خوَن خوەیان گەوزە کردن ــ

تا ئەوین، هەرایْهەر بوو

❖❖

## ( آنانی که در برابرِ مرگ ایستادند )

گفتند «نه!» و

در خونِ خویش غلتیدند ــ

تا عشق، همیشگی باشد

## ( دەرد دەڤران )

ـ کێ ئەڤرەسییە ئەژ دەرد دەڤران؟

ـ دەردەدارێ ک نەڤای ژە دەرد و داخان.

❖❖

## ( دردِ زمانه )

ـ دردِ زمانه را که دریافت؟

ـ دردمندی که گریزان نشد از درد و غم‌ها.

## ( کەلگە خراوە )

هەر گل ک ئەژ نوو بنیا دنم

ئەڤدماێ خوەم کەلاوەێ هێلم ئەژ خوەم؛

تەنیا زەردەوا ئەڤرەسێ ئەژەم

❖❖

## ( ویرانه )

هر بار که می‌آغازم از نو

در قفایِ خود ویرانه‌ای به جا می‌نهم از خویش؛

تنها بادِ پاییزی حرفِ مرا می‌فهمد

## ( ڤايين )

بایێ ڤت:

ئەرێ ئەڤ تاو خوەم

بڤامە کوورا؟!

❖❖

## ( گریز )

باد گفت:

از دستِ خود آیا

گریزم به کجا؟!

## ( بزەخەنە )

جەنگێ ها دە رێ...

بزەخەنەێ دۆ سەرکوومار

مزگۆنا دا!

❖❖

## ( نیشخند )

جنگی در راه...

نیشخندِ دو رئیس‌جمهور

نوید داد!

## ( وشەیل وارانی )

بۆیش دڵپەرێشان

پەژارەیٚ گەل، وەیٚ ئەڵنەوەسیا

گشت وشەیلەیٚ بینە واران

❖❖

## ( واژه‌های بارانی )

شاعرِ آشفته‌دل

اندوهِ خلق را نتوانست سرود

واژه‌هایش همه بارانی شد

## ( لف )

ـ لف کاکەشانەیل کێیە؟

ـ خێیاڵ بەیٚتئەڵوەس

❖❖

## ( همزاد )

ـ همزادِ کهکشان‌ها کیست؟

ـ رؤیایِ شاعر

## ( بەرد و بایٚ )

ڤت "ئێرە پەرتەخ خێیاڵە" بەرد

بایٚ ڤە چەۊ پرتەننیٚ، ئەژەیٚ وێیەرد

❖❖

## ( سنگ و باد )

گفت «اینجا نهایتِ رؤیاست» سنگ

باد، در یک چشم بەهمزدن درنَوَردیدش

## ( پەشێڤی )

ـ پەرێشان بکەرم زلٚف پەژارەت؟

ـ دوویيە بەردیٚ، بایٚ!

❖❖

## ( آشفتگی )

ـ پریشان کُنم زلفِ غمات را؟

ـ سنگ خواهی شد، باد!

## ( ڤهار )

ـ ڤهار كێيە؟

ـ ئەڤەیٚ ک نەتە، چی

❖❖

## ( بهار )

ـ کیست بهار؟

ـ همان که نامده، رفت

## ( خشەیٚ بەڵگ )

بەڵگ دەم با!

گەوراترین پێشهات ئەژ یەڤ دما

خشپەیٚ ژێر پا

❖❖

## ( خش‌خشِ برگ )

برگِ دستخوشِ باد!

بزرگ‌ترین حادثه زین پس

خش‌خشِ زیرِ پا

## ( ڤه منه‌ی گوڵ )

هاڵێم ڤه منه‌ی گوڵێ گرێقم

ک بایێ ئگه‌رد زارووییم برده‌یێ ــ

شاپه‌ریکه‌ل، ئێڤه نه‌ینه‌یێ؟

❖❖

## ( به جستجوی گُل )

هنوز به جستجوی گُلی می‌گریم

که باد همراهِ کودکی‌ام آن را بُرد ــ

شاپرک‌ها، شما ندیدیدَش؟

## ( سه‌وزه‌ڵانی )

سه‌وزه‌ڵانییه‌که‌یێ پاێمان که‌ش...

ڕه‌وک ئه‌سپه‌یل وه‌ره‌و هه‌رلا ڕه‌و بکه‌ن

وه خێیاڵه‌یل زارووییم ڕه‌سن

❖❖

## ( سبزه‌زار )

سبزه‌زارِ کوهپایه...

رمه‌ی اسب‌ها رو به هر سو رَم کنند

به رؤیاهایِ کودکی‌ام می‌رسند

## ( تریفەیٚ ئێش )

ئێش

درکێ دە تاریکیی رێ نییە

چراخ گرشەدارێکە!

❖❖

## ( تابشِ درد )

درد

خاری در تاریکیِ راه نیست

چراغِ فروزانی‌ست!

## ( رزگاری )

ـ کەیٚ خوەت ئەژ سەردەم گەن، رزگار کردی؟

ـ هەیٚک ڤە خوەم ڤتم:

"زرگێژنووک، شیرین‌ترە ئەژ بن‌دەسی."

❖❖

## ( رهایی )

ـ خود را چه هنگام از عصرِ زشتی‌ها رهانیدی؟

ـ آن دَم که گفتم با خویشتن:

«شوکران، شیرین‌تر است از بردگی.»

## ( وەرگری )

ـ ها چە کەری "مەجنوون"؟!

ـ کەڵەکچن دڵ

ک ئەقڵ، تیش هرووم بردنە

❖❖

## ( دفاع )

ـ چه می‌کنی «مجنون»؟!

ـ سنگ‌چینِ دل

که عقل، گرفتارِ ریزش است

## ( گلینەیۆ هەڵبەس )

چ نزیکە!

لەناو گلینەیۆ چاوەیل هەڵبەس

دۆرترین خێیاڵ

❖❖

## ( مردمکِ شعر )

چه نزدیک است!

در مردمکِ چشم‌هایِ شعر

دورترین رؤیا

## ( دەسڕ )

کام دەسڕ

تەپتووز تەنیایی سڕێ؟!

❖❖

## ( دستمال )

کدام دستمال

گردوغبارِ تنهایی را می‌زداید؟!

## ( پەڕ سوور )

مەل پەڕ سوورێ

ئەفڕێ و ئەچڕێ، دڵ منیش

نەپووڕە گەرد قەفەس

❖❖

## ( سُرخ پَر )

پرنده‌ای سُرخ پَر

پروازکُنان می‌خواند، قلب من نیز

با قفس ناسازگار

## ( چمەێتئەڵگر )

چمەێتکێ هە ڤە دەسێ

تا گڕە بنێ ئەژ هەرچی ئازادییە:

پەێکەر ئازادی!

❖❖

## ( مشعل‌دار )

مشعلی در دستاش

تا بسوزاند هرچه آزادی را:

مجسمەی آزادی!

## ( گریمانەێ وەدی هاتن جەهان )

"هەبوون"، ماچ ئەڤینە

ئەڵ تێوڵ "نەبوون"

❖❖

## ( فرضیەی پیدایش جهان )

«هستی»، بوسەی عشق است

بر پیشانیِ «عدم»

## ( ئازا و خوەشالّی )

ـ م بەردم و سەنگینم ئەڵ جاکەیٚ خوەم... ئێڤە کێین؟

ـ شنە و خێیاڵ و چەم... یەیٚمجق دچێم، تا بمینێمن

❖❖

## ( احوال‌پُرسی )

ـ سنگ‌ام و سنگین نشسته‌ام در جای خویش... شما کیستید؟

ـ نسیم و رؤیا و رود... پیوسته می‌رویم، تا بمانیم

## ( سەردەم سەرد )

سەردەمیٚ سەرد...

کیٚ ڕپەیٚ گەرم دڵیٚ نەفرۆتێیە

ڤە حەقدەس مانگانەیٚ؟!

❖❖

## ( دوران سرد )

دورانی سرد...

چه کسی نفروخته، تپشِ گرم قلب‌اش را

به دستمزدی ماهیانه؟!

## ( باڵەل )

دۆ باڵ یەیٚ "فرٚگرتن"ـیٚم

من و تۆ، ئیٚمە و ئانی ــ

تا ئازادی

❖❖

## ( بال‌ها )

دو بالِ یک «پرواز»یم

من و تو، ما و آن‌ها ــ

تا آزادی

## ( فیشکە )

کۆ، فیشکەیٚ کام کانییە؟

❖❖

## ( فوران )

فورانِ کدامین چشمه است، کوه؟

## ( پریسکە )

گرد گەردوون، پریسکەیێکە

ئەژ بلۆوزەیٚ نادیار و

تاهەیٚ ڕووشنیٚ

❖❖

## ( جرقّە )

تمامتِ جهان، جرقّەای‌ست

از یکی شعلەی ناپیدا و

تا ابد روشن

## ( ژین و مەرگ )

ژین، ماژەیل فرەیٚ دێریٚ

مەرگ، یەکیٚ

❖❖

## ( زندگی و مرگ )

زندگی، بسیار چهرەها دارد

مرگ، یکی

## ( ئاواتێگ )

وەرجە گشت باڵندەیل

ئاواتێگ، باڵا کردێیە تا ئاسمان:

کۆەسان

❖❖

## ( آرزویی )

پیش از همه‌ی پرنده‌ها

آرزویی، قد کشیده تا آسمان:

کوهستان

## ( گڕ )

"گڕ"، قرمقاڵە تەنیا

ئەمان، چریکەێ بێدەنگییە "هەرمان"

❖❖

## ( لحظه )

«لحظه»، هیاهوست فقط

«جاودانگی» اما، آوازِ سکوت است

## ( تا کوو؟ )

ـ ژیان، شکووفەیێکە و

مردنیش، شنەشن کزەیّ.

ـ عەترەکەیّ تا کوو دەریّ؟

❖❖

## ( تا کجا؟ )

ـ زندگی، شکوفه‌ای‌ست

و مرگ، آوایِ وزیدنِ نسیمی.

ـ عطرِ آن را تا کجاها می‌بَرَد؟

## ( گوڵ بیّناو )

ئەڵ دیرترین ئاسارەیش

ناو دنێمن، ئەمان هەرگز نەێشنەوێمن

قیژەیّ گوڵیّ بیّناو دە ژێر پامۆ!

❖❖

## ( گُل بی‌نام )

بر دورترین ستاره هم

نام می‌نهیم، ولی هرگز نمی‌شنویم

جیغ گُلی بی‌نام در زیر پایمان!

## ( مەڤدا )

مەڤدایێ ک ڤە چەڤ، کەم دیارە

ڤە دڵ، فرەو

❖❖

## ( فاصله )

فاصله‌ای که به دیده، اندک می‌نُماید

به دل، بسیار است

## ( دروو )

بەدماژەتر دووێ

هەرچێ خوەێ فرەتر ئەڕازنێ ـــ

دروو

❖❖

## ( دروغ )

زشت‌روتر می‌شود

هرچه خود را بیشتر می‌آراید ـ

دروغ

## ( خوداڕەیشتە )

ـ کێ خوداڕەیشتەترینە؟

ـ ڕاسی

❖❖

## ( زیبارو )

ـ زیباترین زیباروِ خدایی کیست؟

ـ راستی

## ( وشەیل )

وشەیل، خێیاڵەیل بەردینن

دە نام دەسەیل بڤەش، گوڵ کەن

❖❖

## ( کلمات )

کلمات، رؤیاهایِ سنگی‌اند

در دست‌هایِ شاعر، شکوفان می‌شوند

## ( پێیاڵە )

ئشق، دەریاو

دڵ ئێمە، پێیاڵە کوچکلەێ

❖❖

## ( ساغر )

عشق، دریاست

دلِ ما، ساغری خُرد

## ( وەگەرد بایۨ )

باڵفرِنەک ڤت:

ئاوەختێکم ڤە دەس زارِووێ

وەگەرد بایۨ، تا مانگ دچم

❖❖

## ( همراهِ باد )

فرفرەی کاغذی گفت:

آرزویی هستم در دستِ کودکی

همراهِ باد، تا ماه می‌روم

## ( ئەقڵ و دڵ )

ئەقڵ وەت: "ئییە منم، کتاوەگەێ ڕێنمایکەر ژیان."

دڵ وەت: "نیەخوەنمەد، بێڕێ!"

❖❖

## ( عقل و دل )

عقل گفت: «این من‌ام، کتابِ رهنمایِ زندگی.»

دل گفت: «نمی‌خوانم‌ات، بیراه!»

## ( ئاسمان )

ـ داڵگەێ ئاسمان ها کوو؟

ـ خێیاڵ و ئاوەخت

❖❖

## ( آسمان )

ـ سرآغازِ آسمان کجاست؟

ـ رؤیا و آرزو

## ( ئازادی )

فره گەردیم،

سۆرتر ئەژ "ئازادی"

هیچ وشەی نەدیم

❖❖

## ( آزادی )

فراوان جُستم،

سُرخ‌تر از «آزادی»

هیچ واژه ندیدم

## ( بەرد )

بتەوترە

بەردی ک دووە وشەی

دە هەڵبەس

❖❖

## ( سنگ )

محکم‌تر است

سنگی که واژه می‌شود

در شعر

## ( کوشت‌وبڕ )

مەنتق پەتی

هۆـ تلێکە

پل دێیارێیە مل ڕەنگینییەل

❖❖

## ( کُشتار )

منطقِ محض

صخره‌ای عظیم است

غلتان بر زیبایی‌ها

## ( درگا )

هزار ڕێگەیْ هەل، هێشتمەۆ دما

تا یەیْ درگایْ حەق، ئەۆ نووام چەکیا

❖❖

## ( دروازه )

هزار کجراهه، پشتِ سر نهادم

تا یک دروازه‌ی حق، در برابرم گشوده گشت

## ( چراێ مانگ )

شەو

وە چراێ گرشەدار مانگ

ها منەی چە؟

❖❖

## ( چراغِ ماه )

شب

به جست‌وجوی چیست

با چراغ پُرفروغِ ماه؟

## ( چاوان ئەسرین )

دە ژێر وارانیش

هەرکە زانس ک ئەسرینن چاوانمان

خوێن لێیان تکیا، پەێ نیشتمان

❖❖

## ( چشمانِ اشک‌بار )

زیر باران هم

هر کسی دانست چشمان‌مان غرق در اشک‌اند

بهرِ وطن، از آن‌ها خون‌ها چکید

## ( شار )

زارڕووەل نەلاونن

پشت دەرگا و دەروەچەیل شار

پڕ ئەژ مەردەزماو!

❖❖

## ( شهر )

لالایی نخوانید برای بچه‌ها

پشتِ دروازه و پنجره‌های شهر

پُر از غول بیابانی‌ست!

## ( همێ )

ـ همێ چەو؟

ـ یەکڵەنەمام تا بن مل چقیاێە دە بەرفێ،

گوڵ کەرێ

❖❖

## ( امید )

ـ چیست امید؟

ـ تک‌نهالِ تا به گردن غرقه در برفی،

گُل می‌دهد

## ( ناهمێدی )

ـ ناهمێدی چەس؟

ـ گڵارِێزان دارسانێک،

دە ناوڕاس وەهار

❖❖

## ( ناامیدی )

ـ ناامیدی چیست؟

ـ برگریزانِ یک جنگل،

در میانەی بهار

## ( ڕەش‌مار )

ڕێ، ڕەش‌مارە

یا گەسێکەت

یا ڤە مرای ڕەسنێکەت

❖❖

## ( سیەمار )

راه، مارِ سیاه است

یا می‌گَزد تو را

یا به مُراد می‌رسانَد

## ( ئەژ پرسیارەلەم )

یەکەڤ گرتن "ڤرەژیە، ئمکە و ئەژیەدما"

ناوێ "مەرگ"ـە یا "ژین هەیتاهەیٚ"؟

❖❖

## ( از پرسش‌هایم )

همنشینیِ «گذشته، اکنون و آینده»

نامش «مرگ» است یا «حیاتِ جاودانه»؟

## ( گەریلا )

لەڤەخەنەێ ئازادییە

گوڵ کردێیە ئەڵسەر لەڤەیل کورد و کۆ ـ

گەریلا!

❖❖

## ( گریلا )

لبخندِ آزادی‌ست

گُل داده بر لبان کُرد و کوه ـ

گریلا!

## ( نەهات )

"نسر"ت پەڕی،

بین ڤە "نسار"!

❖❖

## ( بداقبالی )

«نورِ خدایی»ات رفت،

«همیشه در سایه» شدی!

## ( شوون دەژ )

ـ دەژترین شوون دنیا، کوورەو؟

ـ ئەۆ وڵاتە ک دە هیچ نەخشەێ نییە: دڵ!

❖❖

## ( جایِ بکر )

ـ بکرترین جایِ جهان، کجاست؟

ـ آن سرزمین که در هیچ نقشه نیست: دل!

## ( هات و نهات )

بڕێ "هاتـ"ـن

ک ئەژ بنچەک "نهاتـ"ـن!

❖❖

## ( نیک‌بختی و شوربختی )

برخی «آمد»ند

که از ریشه، «نیامد» دارند!

## ( دیار و نادیار )

ـ ئاخ! دە لا دیارەکەێ دنیا گومەۋ بیمن

ـ خەفەت نەخوە، بەشکم دە کەس‌نەزانەکەێ بووێمنەۋ دی

❖❖

## ( پیدا و پنهان )

ـ آه! در جانبِ پیدایِ جهان، گم گشتیم

ـ غم مخور، شاید اندر پنهانِ آن پیدا شویم

## ( هەڵەبجە )

ئەڤ دمایَ بمواران

شەرمن و بیَکش گوڵ کەرن

دار سێفەیل هەڵەبجە

❖❖

## ( حلبچه )

پس از بمباران

شرمگین و بی‌صدا به گُل می‌نشینند

درختانِ سیبِ حلبچه

## ( سەرهات )

سەرهات کورد:

ئەڵ نزیک چەلاو، چەمێ

پلیا قرەڤ دەریا

❖❖

## ( سرگذشت )

سرگذشت کُرد:

رودباری، در نزدیکیِ مُرداب

پیچید به جانبِ دریا

## ( وشەل داڵکی )

وشەل داڵکییم هەنە کوو؟

هەرچی گوت کەرم ئەڵ چەوەلم

نەێتونم خوەم بخۆنم!

❖❖

## ( کلماتِ مادری )

کلماتِ مادری‌ام کجایند؟

هرچه خیره می‌شوم به چشمانم

نمی‌توانم خود را بخوانم!

## ( دارەل )

هەێک دۊیینەم دارەل

دە بن گووش یەکترەکی پچپەچ کەرن:

"چل ساڵ باڵا کرد و گلێ چقیرٍ نەدا!!"

❖❖

## ( درخت‌ها )

درخت‌ها وقتی مرا می‌بینند

در گوشِ هم پچپچ‌کُنان می‌گویند:

«چهل سال قد کشید و جوانه نزد یک‌بار!»

## ( کاژە بەرف )

ڤەڤ کاژە بەرف دۆەشەڤە

قیلتر و بەرزترن ئەژ هەرڤار ــ

بێدەنگی و کۆسار

❖❖

## ( لایه برف )

با آن لایەبرفِ نازکِ دیشب

ژرفتر و بلندتر از همیشەاند ــ

سکوت و کوهستان

## ( بێقسە )

ڤەختێ هیچ قسەێ ڤەر ڤتن نەێمینێ

دڵ دێیاێ ئەڤ زۆ

شێعر، دەس ئەڵنێ!

❖❖

## ( بی‌کلام )

وقتی هیچ کلامی برای گفتن نمی‌مانَد

زبان به سخن می‌گشاید، دل

شعر، شروع می‌شود!

## ( ئاڵا )

ئاخرێ بایێ کپێ

بێدەرەتان، ئاڵایێ قتقووز!

❖❖

## ( پرچم )

خسته و آرام می‌شود عاقبت باد

بیچاره، پرچمِ مغرور!

## ( وێشە )

ـ وێشە ئەڕا کپ و بێدەنگی؟!

ـ چەوەڕێی هاتن گوڵێک نەشناسم.

❖❖

## ( بیشه )

ـ ای بیشه چرا خاموش و ساکتی؟!

ـ چشم‌به‌راهِ آمدنِ یک گُلِ ناشناخته‌ام.

## ( پارچا )

"هەرچێ مووشن، بیلا بووشن!

م ئەر بان ئی کەمەرە سەوزە مەکەم" ـ

گوڵێ ک سەر وژ ئەڕا ڤا نەچەمانێ ڤت

❖❖

## ( داستان )

«هرچه می‌گویند، بگذار بگویند!

من بر بلندایِ این صخره خواهم رُست» ـ

گُلی که سرِ خود را برای باد خَم نکرد گفت

## ( دەلیا )

ـ توام بوومە دەلیا، بۆش چە بکەم وا؟

ـ هەر چەم بمین، نەوس

❖❖

## ( دریا )

ـ می‌خواهم دریا شوم، چه کنم بگو ای باد؟

ـ همیشه رود بمان، نایست

## ( دمایین پەلوەچ )

ـ ئای! باڵنەکەیٚ ژار و تەنیا

پیرەدار ئاخریٚ کەفت، ئەژیەدما چارەنویست لانەوێزییە.

ـ ئەنوو پەلوەچ دماین، منم... دمینم!

❖❖

## ( آخرین شاخەی نورُستە )

ـ آه! ای پرندەی تنها و بی‌نوا

درختِ کُهن‌سال عاقبت افتاد، از این پس سرنوشت‌ات آوارگی‌ست.

ـ من، بغضِ آخرین جوانه‌ام... می‌مانم!

## ( دماختریٚ )

بایٚ، کڵاو ئەژ سەر داووڵ ئەڕاقەن

ئەفتاویش، دڵە سەردسڕەکەیٚ بەڤیبەرفینە ــ

ئەژ ئێمە چە مینیٚ دمایٚ ئی گەمە؟!

❖❖

## ( عاقبت )

باد، کلاه از سرِ مترسک ربود

و خورشید، دلِ سردِ آدم‌برفی را ـ

از ما چە می‌مانَد آخرِ این بازی؟!

## ( ئەسپ )

هۆچ ئەسپێ

ئاز ڕەسەنن م ڤە خوەم ناشت

بێجەژ "شێعر"

❖❖

## ( اسب )

هیچ اسبی

توان رساندنِ مرا به من نداشت

جز «شعر»

# گوڵدەم سۆر

## ( شکوفەی سُرخ )

ـ ٢٧١٩ کوردی / ١٣٩٨ هەتاوی (خورشیدی) ـ

## ( دەلیلە )

شەڤ چیا...

گوڵئاسارەیٚ ئەڵ پیٚڵاوەکەیٚ هەڤاڵیٚ

ڕیٚنمایٚ تاریکی

❖❖

## ( پیش‌قراول )

شبِ کوهستان...

شبتابی بر کفشِ رفیقی

راهنمایِ تاریکی

## ( ئەڵ بنار )

ئەڤ دمایٚ ڤارۆ

هەفت گەریلا ئەڵ بناریٚ ـــ

تیل سەوز و سۆر

❖❖

## ( بر شیبِ کوه )

پس از باران

هفت گریلا بر شیبِ کوه ـ

رنگین‌کمان

## ( کرێڤە )

کرێڤەیْ سەخت...

ڤە دەمتەقەیْ خێیالْ خوەم

تا سەرکلاوەیْ دیر

❖❖

## ( کولاک )

کولاکِ سخت...

گرم گفتگو در رؤیایِ خود

تا قلّەی دور

## ( سەیْرە )

بچرِ سەیْرە!

ئەژ بەرف ئی ملە بگوارێمن

دەیْ خاکەلێڤەو

❖❖

## ( سُهره )

بخوان سُهره!

از برفِ این گردنه گذر کنیم

دیگر سرآغازِ بهار است

## ( سەرچەوە )

ڤەرەڤ سەرچەوەێ چەم؛

کەفتنە ڤە شوون چوار گەریلا

چەن مای کوچکلەێ سێیا

❖❖

## ( سرچشمه )

رو به سرچشمەی رود؛

راه افتادەاند دنبالِ چهار چریک

چند ماهی سیاهِ کوچولو

## ( مەێدان جەنگ )

چ ئازانە گواریای

ئەژ ئاخلەێ تانکەلۆ

تەمەڵ ئەوپاکەر!

❖❖

## ( میدان نبرد )

چه دلیرانه گذشتی

از چنبرەی تانک‌هایشان

قاصدک!

## ( هەڤاڵ )

"شاگە هەڤاڵ"!

تا ڤتم، جاوەڵجا گوڵدەم ڤاری

ئەژ بنجک و دار

❖❖

## ( رفیق )

«درود رفیق»!

تا گفتم، بی‌درنگ شکوفه بارید

از بوته و درخت

## ( ئاپۆ )

تەریکیی شەڤ...

دەڤرە ک "ئاپۆ" ئەژەێ کلەڤ بی

هەێگوا گوڵ بەیان

❖❖

## ( آپو )

تاریکیِ شب...

آنجایی که «آپو» گذشت

گویی سپیده‌دم

## ( ڕووژنا )

شەو ئەورین...

دو هەڤاڵ، نیشتنە ڤە دەمتەقە

ئەڵ ڕووژنایٚ یەکتر

❖❖

## ( روشنا )

شبِ ابری...

دو رفیق، گرم گفتگو نشستەاند

در روشنایِ هم

## ( تاش )

مزڵگەیٚ گەریلا:

بۆن سەر، تریسکەیٚ ئاسارەل

خوار، تەنیا وازەن

❖❖

## ( صخره )

اُتراقگاهِ گریلا:

بالای سر، سوسویِ ستارەها

پایین، فقط پرتگاه

## ( ئەڤین )

دەسێک لاوێنەر

ئەڵ گڵکوو شەڕڤانێ دە کووبانی؛

هاڵێم هەێ ڤارۆ

❖❖

## ( عشق )

دستی نوازشگر

بر مزارِ جنگاوری در کوبانی؛

هنوز هم باران

## ( خەم )

تۆ نییەسەت هەڤاڵ...

زەمی، ڤە هزار مۆنگ چواردەیش

ڕووشن نێیەو دەێ

❖❖

## ( غم )

تو نیستی رفیق...

زمین با هزار ماهِ کامل هم

روشن نمی‌شود دیگر

## ( مامووستا )

خوەت ئەڤنەشار!

ئی بەرفە یەڕەنگت کەرێ ـ

کۆ، ڕام دنێ

❖❖

## ( استاد )

پنهان نشو!

این برف، یکرنگ‌ات می‌کند ـ

کوه یادم می‌دهد

## ( دۆنە و ئمڕوو )

ڤێنەێ هەڤاڵێ...

نیقەڵتووز دۆنە دوو

ئمڕوو

❖❖

## ( دیروز و امروز )

عکسِ رفیقی...

سرشارِ دیروز می‌شود

امروز

## ( هەنینێ )

هنا کرد "هەڤاڵ..."

تا کل چەڤ دامەڤ دما

مۆنگ چواردە

❖❖

## ( عزیزی )

صدا زد «رفیق...»

تا نگاه به پشتِ سر چرخاندم

قرصِ کاملِ ماه

## ( سیروان )

دۆکوت شەڤگار

داێمن ئەڵ ئاوەکەێ "سیروان" ـــ

دەس هەڤاڵێ بەڵەمم بی

❖❖

## ( سیروان )

نیمه شب

زدیم به آبِ «سیروان» ـ

دست رفیقی قایقم بود

## ( وەنەوشە )

ڤە لەوەخەنەێ

وەنەوشەێ کاڵی دە ڤیرم

نێیەێ هەڤاڵێ

❖❖

## ( بنفشه )

با لبخندی

در ذهنم بنفشه‌ای کاشت

نگاهِ یک رفیق

## ( لره )

لەتێ ئەژ کۆ

ڤە لرەێ هرووم دەرێ، گرد م

بێ تو هەڤاڵ!

❖❖

## ( لرزه )

تکّه‌ای از کوه

فرو می‌ریزد با لرزه‌ای، تمامِ من

بی تو رفیق!

## ( قاوگیر )

بۆم ناپاڵم...

ئاخ! تەنیا قاوگیرێک مەن

ئەژ ئەو زلفدرە

❖❖

## ( سنجاق سر )

بمبِ ناپالم...

آه! تنها یک گیره‌ی سر ماند

از آن گیسوبُلند

## ( سەیل کە! )

سەیل کە هەڤاڵ!

گرد دارەل، دە ڕزگ ئێمە

هانە ڤەراوەر تووفان

❖❖

## ( بنگر! )

بنگر رفیق!

همه‌ی درخت‌ها، در صفِ ما

مقابلِ توفان‌اند

## ( شیرین‌خەو )

شیرین‌خەوێ...

ڕێیەکەمۆ ئەژ یەک جگا نییە هەڤاڵ!

ڤەولاێ مەرگیش

❖❖

## ( رؤیاوار )

رؤیایی شیرین...

راه‌مان از هم جدا نیست رفیق!

در آن‌سوِی مرگ نیز

## ( دۆتەل شەڕکەر )

دۆتەل شەڕکەر کوردا!

ئەژ کوم ژۆن و ئێش داڵکەلتۆ

چەک سازینە؟

❖❖

## ( دخترانِ جنگاور )

دخترانِ جنگاور کُرد!

از کدامین درد و رنجِ مادران‌تان

اسلحه ساخته‌اید؟

## ( ئەڵکردن )

زەردەخەنەێ هەڤاڵێ...

شنەباێ ئەڵکەرێ، ئەژ شەش لا

تا کووره ک نەێچم!

❖❖

## ( وزش )

لبخندِ رفیقی...

نسیم می‌وزد، از شش جهت

تا کجاها که نمی‌روم!

## ( گووچنگ )

شەڤەزەنگ...

ئەلی ڕێی ناهماره، گووچنگەم

دەس ئاواڵێ

❖❖

## ( عصا )

شبِ بی‌ستاره...

در این راهِ ناهموار، عصایم

دستِ رفیقی

## ( ئامانج )

تریسکەتریسکێ دیر...

ئەی! ئەژ پەرتخ، ڕەژیدەتر

خود ڕێیە

❖❖

## ( آرمان )

سوسویی دور...

آه! زیباتر از مقصد و مقصود

خودِ راه

## ( نەسرینەل )

ئگەرد نەسرینەل

ئەژ ژێر بەرف باڵا کەرن

گەریلال

❖❖

## ( نسرین‌ها )

همراه نسرین‌ها

از زیر برف قد می‌کشند

گریلاها

## ( شەهید )

ڤهار سالێ ترەک...

دەڤۆرە ک "بنەفش" شەهید بی

گوڵ بنەفشەیٚ

❖❖

## ( شهید )

بهار سالِ بعد...

آنجا که «بنفش» شهید شد

گُل بنفشه‌ای

## ( زەردەخەنەیٚ مۆنگ )

هە دە ڤیرم هەڤاڵ!

هەنیٚ ئەژ یەکتری دەرڤڕیایٚمن

زەردەخەنەیٚ مۆنگ پەڕی

❖❖

## ( لبخندِ ماه )

خاطرم هست رفیق!

وقتی از همدیگر جدا شدیم

لبخندِ ماه پرید

## ( سەرکڵاوان )

چ نزیکن!

سەرکڵاوان بەرفگرتەیٚ بریقەدار

ئەژ دەرڤەچ گلارەیٚ هەڤاڵەکەم

❖❖

## ( قلّه‌ها )

چه نزدیک‌اند!

قلّه‌های برف‌پوشِ درخشان

از دریچه‌ی چشمِ رفیقم

## ( گوڵپەڕەیل )

زەردەخەنەیٚ هەڤاڵیٚ؛

گوڵپەڕەیلیٚ ئەۋکردەن

داوودیی زەرد

❖❖

## ( گُلبرگ‌ها )

لبخندِ رفیقی؛

گُلبرگ‌هایش گشوده‌اند

داوودیِ زرد

## ( سەریاڵ ڕەنگینی )

دچمە بان یاڵ

ئاهـ ! ئەو نوواێ م خوەیاٚن ڕەساننە ــ

وەنەوشەیل

❖❖

## ( ستیغِ زیبایی )

از کوه بالا می‌روم

آه! پیش از من خود را رسانده‌اند ــ

بنفشه‌ها

## ( لێزگا )

دە ئی ڕفتە

کلوور داربەلییێ لێزگەمە؛

بێلە بوواریێ!

❖❖

## ( پناهگاه )

در این تُندبار

تنه‌ی توخالیِ بلوطی سرپناهم؛

بُگذار ببارد!

## ( پێچەڵپێچ )

بێ مۆنگ

ئەڵەو پێچەڵپێچ تیلەڕێیە؛

ڤیرم ڕووشن

❖❖

## ( پیچوخم )

بی ماه

در آن پیچوخمِ باریکه‌راه؛

ذهنم روشن

## ( جگاکاری )

ئای! هەڤاڵ

ناو ئەو ئەڵکردنەلە گردۆ، تو

ناو ئی هەمکە پژارەلە، م

❖❖

## ( تفاوت )

آه! رفیق

نام همه‌ی آن وزیدن‌ها، تو

نام این‌همه غم‌ها، من

## ( بنجک )

ده پەنا بنجک گوڵکردەیٚ

لیل تفەنگ گرتمە ڤەرەڤ ئەڤ لا

ک دڕکەل ڤەر کردنە ئەڵەیٚ

❖❖

## ( بوته )

در پناهِ بوته‌ای شکوفان

لوله‌ی تفنگ به آن سمتی گرفته‌ام

که خارها رو به آن‌جا

## ( بایەڕووە )

دمایٚ بایەڕووە

دەناو ئی باخە مەنیەیە گوڵدەمیٚ؟

ئای! زەردەخەنەیٚ هەڤاڵیٚ

❖❖

## ( توفان )

پس از توفان

در این باغ مانده شکوفه‌ای؟

آه! لبخندِ رفیقی

## ( جمیاێن )

لێڵە دا

گژەیٚ گژەباێیش کپیا؛

هەنیٚ گەریلا جمیا

❖❖

## ( حرکت )

هنگام گُرگ‌ومیش

صدای تُندبادِ خزان هم آرام گرفت؛

گریلا که راه افتاد

## ( ئەژ ناو بەرف )

ڕزگیٚ گەریلا

ئەژ ناو بەرفەل گواریا

شوون زەردەخەنەیٚ

❖❖

## ( از میانِ برف )

ستونی گریلا

گذشت از میانِ برف‌ها

ردّ لبخندش

## ( بتەڤ )

تاویایێن بەرف...

پێلاڵێ سۆر هەڤاڵێ کردمەڤ دی

بتەڤ، تا گۆم دماینێ

❖❖

## ( استوار )

آب‌شدنِ برف‌ها...

کفش قرمزِ رفیقی را یافتم

استوار، تا آخرین قدم

## ( ڕنوو )

ڕەنگین بین ڕنوو!

تا ڤەختێ هرووم نەڤردۆیین

ڤە سەر هەڤاڵەلم

❖❖

## ( بهمن )

زیبا بودی بهمن!

تا وقتی فرو نریخته بودی

بر سرِ رفقایم

## ( ئێڤەت )

ڕنگەێ ڤارۆ ئەڵ دوواریێ

هەڤاڵێ، ڤە ملپێچەکەێ خوەێ

پێچنێ زەم هەڤاڵێ

❖❖

## ( تیمار )

آوایِ باران بر سیاه‌چادر

با شال گردنِ خویش، رفیقی

می‌بندد زخمِ رفیقی را

## ( سەنگەر )

گرمەگرم تووپ

نێیەێ هەر هەڤاڵ، سەنگەرێ

ڤەر ئەۆیەکەێ تر

❖❖

## ( سنگر )

صدای انفجارِ توپ

نگاه هر رفیق، سنگری

برای دیگری

( تەریکترین ڕێ )

ئەڵ تەریکترین ڕێ

هۆچ ڤەرزێ گوم نەێکەرم ــ

زەردەخەنەێ هەڤاڵم هەس

❖❖

( تاریک‌ترین راه )

در تاریک‌ترین راه

گم نمی‌کنم هیچ فصلی را ــ

لبخندِ رفیقم هست

( چیین )

هەڤاڵێ چی،

نەێڤەچێ تا پرچەلێ

هە دەناو بەرف

❖❖

( رفتن )

رفیقی رفت،

نيِ نورُستەای تا کاکُل‌اش

در برف

## ( دیمەن ڕەنگین )

کل چەڤ دمەڤ دما

گوڵدەمەل، شەڤنمینن هاڵێم هەێ

دەڤرە ک هەڤاڵەلم هووسیانە

❖❖

## ( چشم‌انداز زیبا )

می‌نگرم به پشتِ سر

شکوفه‌ها، هنوز هم شبنم‌آلودند

آنجا که رفقایم ایستاده‌اند

## ( دەرڤەن )

"دەڤ دەرڤەن قیلە

بێلە تا ڕێیەکەت ڕووشن بکەرم."

مانگ ڤە گەریلا ڤت

❖❖

## ( درّه )

«در آن درّه‌ی ژرف

بگذار تا روشن کنم راهت.»

به گریلا گفت مهتاب

## ( مۆنگ کەل )

دمایٚ شەڕ...

ئەڵ ڕووشنایٚ مۆنگ کەل

یەکیٚ ئەژ هەڤاڵەل، کەم

❖❖

## ( ماهِ لب‌پریده )

پس از نبرد...

در نور ماهِ لب‌پریده

یکی از رفقا، کم

## ( گڵکوو )

مەڤدایٚ نییە

دە ناون من و هەڤاڵەکەم، بێجەژ

سەنگ گڵکووەیٚ

❖❖

## ( مزار )

فاصله‌ای نیست

میان من و رفیقم، جز

سنگِ مزارش

## ( تەنیا هانا )

سەردە ڤا...

زەردەخەنەیٚ گەریلا

تەنیا هانا

❖❖

## ( تنها پناه )

باد سردِ پاییزی...

لبخندِ گریلا

تنها پناه

## ( ملە )

قازقولنگەل

ها ئەژەڤ ملەیٚ پڕ بەرفە گوارن ک گەریلا

شەڤەکی رچیٚ ئشکەن

❖❖

## ( گردنه )

عبورِ دُرناها

از همان گردنەی پُربرفی که گریلا

صبح، راهِ تازەای در آن گشود

## ( قەندیل )

بنار قەندیل...

دەوٚرە ک تاویایە بەرف

گڵکوو گەریلایێکە

❖❖

## ( کوه قندیل )

دامنەی قندیل...

آنجایی که برف‌ها آب شده

مزارِ یک گریلاست

## ( هەڵاڵەبرمە )

بەژن و باڵاێ کوٚ

ڤە یەێگل هەڵاڵەبرمەو

ئەڵسەر تەرم شەهید

❖❖

## ( لالەی واژگون )

قد و قامتِ کوه

یکبارە لالەی واژگون است

بر سر پیکرِ شهید

## ( هاوڕێ )

له دریژایی تۆلەڕێ

بێ وچان وەگەرد گەریلا

مانگ

❖❖

## ( همراه )

در طولِ کوره‌راه

بی‌وقفه همراهِ گریلا

ماه

## ( گورجانە )

دۆتەل چیا

زیتر ئەژ کەلەوا ئەڵکەرن

ڤە بووخوەش مزگانا

❖❖

## ( چابکانه )

دخترانِ کوهستان

زودتر از بادِ بهار می‌وزند

با عطرِ مژده‌ها

## ( ئاهەڕێ )

پایزەشەو

ئەڵ ئەو ئاهەڕایێ ک ڤەێ چینە، هەڤاڵ!

کەڵمەسەل هانە خەڤەر

❖❖

## ( سخت‌راه )

شبِ پاییزی

بر آن راهِ دشواری که رفته‌ای، رفیق!

بیدارند گُل‌های حسرت

## ( ڕەنگینی )

ئەڵ یەێ شۆ کلاشنیکۆفێ

ئەڵ ئەو شۆنێ پەرپریکێ ــ

ژنە گەریلایێ کوردێ!

❖❖

## ( زیبایی )

بر یک شانه کلاشنیکف

بر شانه‌ی دیگرش پروانه‌ای ــ

چریکِ زنِ کُردی!

## ( گوڵهەساره )

تریسکەیٚ گوڵهەساره

ئەڵکەنیا ئەژ سێیاتیی دەۆرگردیٚ؛

ڕێوار ڕێگەیٚ دیرم

❖❖

## ( شبتاب )

سوسویِ شبتاب

کَنده شد از سیاهیِ پیرامونش؛

مسافرِ راهِ دورم

## ( جەنگاوەر )

ـ کوورا دچی جەنگاوەر؟

ـ دەۆره ک ئاولەفاو دچوو

❖❖

## ( جنگاور )

ـ کجا می‌روی جنگاور؟

ـ آنجا که سیلاب می‌رود

## ( کووچ دماین )

ـ ئەژ کووچ دماین، کێ گل ناورد؟

ـ قازقولنگەڵ، سێ پریسکەل... ئاخ! یاران

❖❖

## ( آخرین هجرت )

ـ چه کسی بازنگشت از آخرین هجرت؟

ـ دُرناها، پرستوها... آه! یاران

## ( زمگە )

ئیلا کۆ، ئەوۆلا کۆ

مانگ ژە کام پەلەڕێ هڵات

ئەڵ زمگەێ گەریلا؟

❖❖

## ( مأمن زمستانی )

این سو کوه، آن سو کوه

از کدامین باریکه‌راه بردَمید ماه

بر پناهگاهِ زمستانیِ گریلا؟

## ( زاگرۆس )

ئاهەڕا بنار زاگرۆس

نوقم بەرف، دەرێکەمۆ ڤەرەو نووا

مزگانا گوڵدەم سۆر

❖❖

## ( زاگرس )

کوره‌راهِ سختِ زاگرس

غرقه در برف، به پیش می‌بَرَد ما را

مژده‌ی شکوفه‌ی سُرخ

## ( ئەژ دیر )

هەڤاڵێ هەنین

دەس ئەرم ئەڵشەنێ ئەژ دیر ــ

دەێرە دار، گوڵدەم دڤارنێ!

❖❖

## ( از دور )

رفیقِ نورچشمی

دست تکان می‌دهد برایم از دور ــ

اینجا درخت، شکوفه می‌باراند!

## ( چوار گوڵ سۆر )

دمایۆ بمڤارۆ...

چوار گوڵ سۆر، ئەڵ پەڕەیۆ بەرف

ڕۆمان "ڤهار زیڕەس"

❖❖

## ( چهار گُل‌سرخ )

بعدِ بمباران...

چهار گُل‌سرخ، بر صفحه‌ی برف

رُمان «بهارِ زودرس»

## ( دە ڤیرم )

مانگ چی و ساڵیش...

کاڵەۊ نەڤی دە ڤیرم، زەردەخەنەیۆ هەڤاڵۆ

دمایۆ چیین

❖❖

## ( در خاطرم )

ماه رفت و سال هم...

کم‌رنگ نشد در خاطرم، لبخندِ رفیقی

پس از رفتن

## ( ئڵاتن )

ئگەرد ئڵاتن خوەر

ئەڵ مزڵگەیٚ شەڤانەم، همسایٚ:

گوڵ هیٚرروویٚ!

❖❖

## ( طلوع )

با طلوعِ خورشید

در اُتراقگاهِ شبانه‌ام، همسایه‌ای:

یک گُل خطمی!

## ( فیٚر بکە! )

فیٚر بکە!

دە ڕووژهەڵات، ڕیشە کوتیایٚە

سایٚ ئەڵ ڕووژئاڤا

❖❖

## ( نگاه کُن! )

نگاه کُن!

در شرق، ریشه دوانده

سایه‌اش بر غرب

## ( خەڵتان خین )

دما نێیە

ئەڵ ئێڤارەێ پایزەڕووێ ـ

لەشێ خەڵتان خین

❖❖

## ( غرقه در خون )

واپسین نگاه

به غروبِ یک روزِ پاییزی ـ

پیکرش غرقه در خون

## ( کڵ )

ئشنەوێمن

ئەژ تلیلیی داڵک شەهیدێ،

گرد قسەلەێ نەڤتەێ

❖❖

## ( هلهله )

می‌شنویم

از هلهله‌ی مادرِ شهیدی،

همه‌ی نگفته‌هایش

(ماڵگە )

لێزمەی ڤارۆ...

ئمکە لێزگەی چەن مەلیچک

زمگەی گەریلا

❖❖

( مأوا )

رگبارِ باران...

اکنون آشیانەی چند گنجشک

پناهگاهِ زمستانیِ گریلا

( شایی )

ئەژ نوو ڤهار؛

یاڵ درای ئەژ ناو تەم

م ئەژ خەم

❖❖

( شادی )

باز بهار؛

قلّه بیرون می‌شود از مِه

من از غم

## ( ختیمتی )

کڵاشەل دڕیایە...

دە ڕێیە دژوارەکەێ شاخ

ختیمتییم دێ، شنەباێ

❖❖

## ( قلقلک )

گیوه‌هایِ پاره...

در سخت راهِ کوهستان

نسیم، قلقلکم می‌دهد

## ( نەرگس )

چەپەێ گوڵ نەرگس

شەکەتیی کۆگەردی ئەژ لەشم سڕی ـ

لەۆەخەنەێ ئاواڵەلم

❖❖

## ( نرگس )

دسته‌گُلِ نرگس

خستگیِ کوه‌پیمایی از تنم زدود ـ

لبخندِ رفقایِ همقطارم

## ( کەنیلک )

وچۆنێ ئەڵ بنار قەندیل؛

یەکەۋ گرتن زەردەخەنەێ مۆنگ و گەریلا

دەناو کەنیلکێ

❖❖

## ( چشمەی کوچک )

درنگی بر دامنەی قندیل؛

همنشینیِ لبخندِ ماه و گریلا

در چشمەای کوچک

## ( هشکەساڵ )

قسەێ کەری هەڤاڵ...

بنجکێ گوڵ گرێ

دەی هشکەساڵە!

❖❖

## ( خشک‌سال )

حرفی می‌زنی رفیق...

بوتەای گُل می‌دهد

در این خشک‌سال!

## ( ڕێنما )

تاریکەشەو...

خوڕەی چەم لێڵێ

تەنیا چراخم

❖❖

## ( راهنما )

شبِ تاریک...

صدای رودی گل‌آلود

تنها چراغم

## ( دالاهوو )

دووازە گەریلا...

ئەڵ بەرف بنار دالاهوو

یەی شوون پا

❖❖

## ( دالاهو )

دوازده گریلا...

بر برفِ دامنەی دالاهو

یک ردّپا

## ( خوەشی )

ڤەرەژ گوڵدەم

مزگانایێ بهار ڤەم دا؛

گەریلا

❖❖

## ( شادمانی )

پیش از شکوفه

مژدەی آمدنِ بهارم داد؛

گریلا

## ( گولە )

ئەژ هەر لا گیزەیێ گولە...

لەوەخەنەیێ هەڤاڵەل نەیلێ ئەو ڕاو

زەمێ بڤینم

❖❖

## ( گلوله )

نفیرِ گلوله از هر سو...

لبخندِ همقطاران فرصت نمی‌دهد

زخم ببینم

## ( بنەفش یا نەرگس؟ )

بنەفش بی، یا نەرگس؟
ڕاس دەوره ک ڕەشەو بی
ئگەرد کەفتن بمێ

❖❖

## ( بنفشه یا نرگس؟ )

بنفشه بود یا نرگس؟
درست آنجا که سیاه شد
با سقوط بُمب

## ( گڵکوو بێناو )

گوڵێ سۆر
ئەڵسەر گڵکووێ بێناو ــ
هێمن خەوسێیە جەنگاوەر

❖❖

## ( گور بی‌نام )

یک گُل سرخ
بر سر گوری بی‌نام ــ
جنگجو خُفته آرام

## ( یەیٚ ئەنە )

شەکەت نەڤی

ئاسارە ئەژ تریسکەتریسک

خێیاڵم ئەژ باڵا کردن

❖❖

## ( یک‌نَفَس )

خسته نشد

ستاره از سوسو زدن

خیالم از قد کشیدن

## ( پەت ڤەم نەیٚ! )

شکووفەل یەێڕووە؛

تا دخوازم یەک یەک بژناسمۆ

هووفەیٚ بایٚ

❖❖

## ( مهلت‌ام نمی‌دهد! )

شکوفه‌های یک‌روزه؛

تا می‌خواهم یکی‌یکی بشناسم‌شان

هوهوی ِباد

## ( دڵگاوی )

**دڵ قەسیمە ڤە کۆ**

**تا نەکەفم!**

❖❖

## ( تسلّی )

**دل به کوه بستەام**

**تا نیُفتم!**

## ( بێکەرخ )

**باڵنەیٚ کووچەر...**

**گەریلایش، زەمی چی ئاسمۆ**

**بێکەرخ دۆیینێ**

❖❖

## ( بی‌مرز )

**پرندەی مهاجر...**

**گریلا هم، زمین را چون آسمان**

**بی‌مرز می‌بیند**

## ( پەلە )

پا ئەڵگرا!

ڕێیەکەێ هەردکمۆ پێچەڵپێچە؛

ڤە لیلووپەڕێ ڤتم

❖❖

## ( تعجیل )

شتاب کُن!

راه هردوی ما پُرپیچ‌وخم است؛

به نیلوفری گفتم

## ( ڤڵەشە )

کووبانی؛

دمائ تارەنن تارمایيەل

شەڤمۆنگ

❖❖

## ( درخشش )

کوبانی؛

بعدِ گریزاندنِ اشباح

شبِ مهتابی

## ( تاهەیٚ )

ڤەرەژ ئێمه

ئەڤ ئاساره بییەسەیٚ ـ

دمایٚ ئێمەیش

❖❖

## ( تا ابد )

پیش از ما

بوده آن ستاره ـ

بعدِ ما نیز

## ( ده ئەڤ سەنگەره )

زەمەقیٚ بنەڤش...

ڕاس دەڤ سەنگەره ک ئەژ هەڤالیٚ

تەنیا قەلیٚ پرتاڵ خینین مەن

❖❖

## ( در آن سنگر )

زنبقی بنفش...

درست در آن سنگر که از رفیقی

تنها تکّه‌ای لباسِ خونین ماند

## ( شەڤنم )

لەش خینین ئاواڵێک...

شەڤنم ئەڵ گوڵەشەرمووکە نیشتێیە

یا گژنیژەیۆ ئەرەخ؟

❖❖

## ( شبنم )

پیکرِ خونینِ رفیقی...

بر لالەی واژگون، شبنم نشسته

یا دانەهای عرقِ ریز؟

## ( ساڵەل شەڕ )

ساڵەل شەڕ...

چ ئازایۆ پیرەڤ دوون

داڵکەل!

❖❖

## ( سال‌های جنگ )

سال‌های جنگ...

چه زود پیر می‌شوند

مادران!

## ( دمایین هناس )

سێ تەقەێ ئەڵدم یەک...

دەسئەڵنا، ئگەرد دمایین هناس

ڤارشت شکووفەێ گێڵاس!

❖❖

## ( آخرین نَفَس )

سه شلیکِ پیاپی...

با کشیدنِ آخرین نَفَس، آغازید

بارشِ شکوفەی گیلاس!

## ( ڤەسنگەێ مەنن )

دەێره هەر خێیاڵ

چەک خسێیه ئەڤ شۆنێ،

تا بمینێ

❖❖

## ( برای ماندن )

اینجا هر رؤیا

اسلحه بر دوش گرفته،

تا بماند

## ( سەنگەر چیایی )

ئێرە و پەژارە؟!

دە ناو کەڵکە ـ سەنگەرێک نیشتمە

همساکەم، ئاسارەزلە

❖❖

## ( سنگر کوهستانی )

اینجا و اندوه؟!

نشسته‌ام درون سنگری در کوه

همسایه‌ام، ستاره‌ی صبح

## ( تەنیا بەرف )

ئەڵ سەریاڵ...

تا چەو بڕ کەرێ، تەنیا بەرف

هەڤاڵێ هنا کەرێ: "بەهار"!

❖❖

## ( تنها برف )

بر ستیغِ کوه...

تا چشم کار می‌کند، تنها برف

رفیقی صدا می‌زند: «بهار»!

## ( ئەرخەوان )

ئەڵ پەل ئەرخەوان

یەیۆ شکووفەیۆ تەنیا،

چنیینێ قەت

❖❖

## ( ارغوان )

بر شاخه‌ی ارغوان

یک شکوفه‌ی تنها،

چیدنش هرگز

## ( ڤڵات ئازاد )

دە ناوتوو پەڕەیل یەیۆ گوڵیش

تۆنم بژییم ـ

ئەر "ڤڵات ئازاد" م بوو

❖❖

## ( سرزمین آزاد )

لابه‌لای گُلبرگ‌های یک گُل هم

می‌توانم زیست ـ

اگر «سرزمین آزادِ» من باشد

## ( جیک )

دە ژێر ڤارۆ

جیک دا یەکم گیایێ گورج؛

زەردەخەنەم!

❖❖

## ( جوانە )

زیرِ باران

جوانە زد نخستین گیاهِ چابک؛

لبخندم!

## ( سەرکەفتن زەردەخەنە )

زەردەخەنەیێ شەڕڤانێ

دە ڕووژئاڤایێ کوردستان، ئاوردەڤ خوار

ئالا کرژئلەتەکەیێ داعش

❖❖

## ( پیروزیِ لبخند )

لبخندِ جنگاوری

در روژآوای کُردستان، فرو کشید

پرچمِ عبوسِ داعش را

## ( پێشهات )

ئەڵ قەیێ تل گەپێ

پێشهات گەپترێ:

گوڵێ!

❖❖

## ( حادثه )

بر قامتِ صخره‌ی بزرگی

بزرگ‌تر حادثه‌ای:

گُلی!

## ( کەمێ ئەڤین )

نە باڵ و نە بڵنگییێ،

کەمێ ئەڤین خوازێ

"فڕین!"

❖❖

## ( اندکی عشق )

نه بال و نه بلندایی،

اندکی عشق می‌خواهد

«پرواز!»

# چەمێ ئەژ چریکەێ بەرد

## ( رودی از آواز سنگ )

ـ ٢٧١٨ کوردی / ١٣٩٧ هەتاوی (خورشیدی) ـ

( بیین )

تێژتر ئەژ زق

سەرهشکتر ئەژ بەرد؛

"کوڵە ئەڵوەس"ـەکەێ گوڵ نەسرین!

❖❖

( بودن )

بُرّندەتر از سرما و یخ

سرسخت‌تر از سنگ؛

«هایکو»ی گُلِ نسرین!

( ئاشتی )

تلیلیی داڵکەل ئاشتی

بەرزتر ئەژ شینوەێ شەڕ!

❖❖

( صلح )

هلهلەی مادرانِ صلح

بلندتر از ولولەی جنگ!

## ( دەرڤەن بایێ )

دە لێڤار دەرڤەن بایێ

یەکڵەدارێ پاڤەگەزدێ

ناوێ "همێ"!

❖❖

## ( درّەی باد )

بر لبەی درّەی باد

تک‌درختِ استواری

نامش «امید»!

## ( گل‌گلێ )

گل‌گلێ

گیئاسارەێ

دارسۆنێ داگیرسنێ!

❖❖

## ( گاەگاهی )

گاەگاهی

کِرم شبتابی

برمی‌افروزد جنگلی را!

## ( بێدەنگیی ئاسارە )

چریکەی بێدەنگیی ئاسارە ئژنەڤی؟!

❖❖

## ( سکوتِ ستاره )

آوایِ سکوتِ ستاره را می‌شنوی؟!

## ( پەرجوو )

ژن خەنس

دار ژین، گوڵ کرد

هەن ڤارین بەرف!

❖❖

## ( اعجاز )

زن خندید

غرق در شکوفه شد درختِ زندگی

هنگامِ برف!

## ( تەمیرەی ڤارۆ )

ڤەڕاس، ژەنیار تەمیرەی ڤارۆ کێیە؟!

❖❖

## ( تنبورِ باران )

راستی، نوازندەی تنبورِ باران کیست؟!

## ( مۆنگەشەو )

کرم شەوچرای کوچکڵەیکە

مۆنگەشەو ئی دارسۆنە!

❖❖

## ( مهتاب )

کِرم شبتابِ کوچکی‌ست

مهتابِ این جنگل!

## ( داووڵ )

بێ دڵەڕاوکێ

باڵنەێ نیشتێیە ئەڵسەر شۆنێ:

داووڵ!

❖❖

## ( مترسک )

بی ترس و تشویش

پرنده‌ای نشسته روی دوشش:

مترسک!

## ( هووره )

ڕووح ئاو، لیپالیپ ئەژ هوورەو... ڤەرچە؟!

❖❖

## ( آوازِ اهورایی )

لبریزِ آوازِ اهورایی‌ست روحِ آب... چرا؟!

## ( دیرترین ئاسارەل )

ئەرێ زەردەخەنە

ڕووژنایێ ڕێڤارێکە

ئەژ دیرترین ئاسارەل؟!

❖❖

## ( دورترین ستاره‌ها )

آیا لبخند

نورِ رهگذری‌ست

از دورترین ستاره‌ها؟!

## ( ڤەچە؟ )

بایێ

بێ پاسپۆرت و پشکنین

ڤەچە سەفەر کەرێ؟!

❖❖

## ( چگونه؟ )

باد

چگونه سفر می‌کند

بی پاسپورت و تفتیش؟!

## ( پڕتافانن )

شەڤەزەنگ...

مۆنگ، ئەسپەکەێ ڕووژنا تاو دا

ڤەرەڤ کوورا؟!

❖❖

## ( تازاندن )

قیرگون شب...

ماه، اسبِ روشنایی تازاند

رو به کجا؟!

## ( ڕفت )

ڕفت کوم ئاگر

تین دڵ خاک ئشکەن و

سەڤزمۆ کرد؟!

❖❖

## ( تُندبار )

رگبارِ تُندِ کدام آتش

فرونشانید عطشِ خاک و

سبزمان کرد؟!

## ( ڕێوار )

ڕێوارەکەت کێیە دەریا

سێڵاو ڤهارە

یا پایزەپڵە؟!

❖❖

## ( مسافر )

دریا، مسافرت کیست

سیلابِ بهاری

یا بارانِ پاییزی؟!

## ( بەرزەهەوایلە )

ئەڵوەسێ

ئەڵڤەسێکەم بێ ڤچۆ تا یاڵەکەێ خوەر:

بەرزەهەوایلەیێک بێ باڵ و پەڕ!

❖❖

## ( بادبادک )

شعری مرا

بی‌وقفه می‌سُراید تا ستیغِ آفتاب:

بادبادکی بی‌بال و پر!

## ( ڕووژهەڵاتی )

بێیا

"ڕووژهەڵاتی"ـیە دڵم

باوڕ بکە ئەفتاو!

❖❖

( شرقی )

بیا

«شرقی»ست دلم

خورشید باور کُن!

## ( ئاێنەل گرێڤەکەر )

ئشکیا دە دەفتەر ئاێنەل گرێڤەکەر، کڕیٚ:

ژن

ژین

ژۆ

❖❖

## ( آینه‌هایِ گریان )

شکست در دفتر آینه‌هایِ گریان، سطری:

زن

زندگی

درد

## ( بێزە )

تەمسقتر ئەژ

گرد میڤەل ئی ڤەرزەسەو هاڵێ:

کیزێ ئازادی!

❖❖

## ( ویار )

نوبرانه‌تر از

همه‌ی میوه‌های فصل است هنوز:

یک قاچ آزادی!

## ( بەێچەڵی )

بەڵگ پاییزی

شەکەت ئەژ بەێچەڵیی بایٚ، ئاوەخت خوازیٚ:

خوەشاڵە ئیگلە ئەژ "کەوٚر" بێیام ڤەدی!

❖❖

## ( بازیگوشی )

برگِ پاییزی

خسته از بازیگوشیِ باد، آرزو می‌کند:

کاش از صخره زاده شوم این‌بار!

## ( نەرمنووڵی )

دە ناو بەرد، نەرمنووڵییٚ هەس

ک دە حەریر ئاو نییە!

❖❖

## ( لطافت )

در سنگ، لطافتی هست

که در حریرِ آب نیست!

## ( دەرڤەچ بەرد )

ئاو خەوێ، ئاێنە خەوێ

ئەما دەرڤەچ بەرد

هادە خەڤەر تاهەێ!

❖❖

## ( دریچەی سنگ )

آب و آینه هم می‌خوابند

اما دریچەی سنگ

تا ابد بیدار است!

## ( ڕاز )

گۆم ڕازێکە

بەردا!

❖❖

## ( راز )

برکەی رازی‌ست

سنگ!

## ( سان ساروو )

تەمیرەێ نادیار سەنگ

سەرمەس خوەنێ تاهەێ!

❖❖

## ( سنگِ شیدا )

تنبورِ ناپیدایِ سنگ

تا ابد سرمست می‌خواند!

## ( ڤێشەێ سەنگ )

گل‌گلێ

دە ڤێشەێ سەنگ

پەڵنگ زەمدارێ نەڕنێ!

❖❖

## ( بیشەی سنگ )

گهگاهی

در بیشەی سنگ

می‌غُرّد یک پلنگِ زخمی!

## ( گومەل بەرد )

دە ناو گومەل بەرد

بنجک زەردەخەنەیٚ گوڵ کرد!

❖❖

## ( مشتِ سنگ )

در مشتِ سنگ

بوتەی لبخندی شکُفت!

## ( ئاڤاز یاسەمەنەل )

ئاڤاز یاسەمەنەل نەشنەفتینە

ئەژ گەلیی بەرد؟!

❖❖

## ( آواز یاسمن‌ها )

آواز یاسمن‌ها را نشنیده‌ای

از حنجره‌ی سنگ؟!

## ( چیایی )

ناو هووزەکەم

تاشیایەو

دە ڕۆمان "کۆ"!

❖❖

## ( کوهستانی )

نامِ قبیلەام

حک شده

در رُمانِ «کوە»!

## ( گەشتنامە )

دما فەسڵ گەشتنامەێ دڵووپ

دەریاو!

❖❖

## ( سفرنامە )

آخرین فصلِ سفرنامەی قطره

دریاست!

## ( دەریا و مانا )

گڕ دە ڤەر خوەیٚ خس دلۆوپ،

ڕەسی ڤە دەریا!

گەردیلە، تاویا دە ئشق

ڕەسی ڤە مانا!

❖❖

## ( دریا و معنا )

قطرەی آتش‌زده در خویش،

به دریا رسید!

ذرّەی بگداخته در عشق،

به معنا رسید!

## ( فڕین )

ئەڤین، فڕین و

دەریا، ئاسمۆن فڕین دلۆوپەیلە

❖❖

## ( پَر کشیدن )

عشق، پرواز است و

دریا، آسمانِ پروازِ قطره‌ها

## ( دڵۆوپ )

دڵۆوپ،

دەرڤەچێک ئەڤکردەو

ڤەرەو دەریا!

❖❖

## ( قطره )

قطره،

یک پنجره‌ی بازِ

به سمتِ دریاست!

## ( بێ باڵ و پەڕ )

باڵگرتنێ

بێ باڵ و پەڕ:

ئنسان!

❖❖

## ( بی بال و پَر )

پروازی

بی بال و پر:

انسان!

## ( ئەڵوەس )

مردن، دەسقەن زەمانە ئەڵ دەسەلم

زنەی، پاقەن خاکە ئەڵ پام

ئەما کلیل دەس و پایٚ ڤەسەمیش: ئەڵوەس!

❖❖

## ( شعر )

مرگ، دستبندِ زمان است بر دستانم

زندگی، پابندِ خاک است بر پایم

اما شعر نیز کلیدِ دست‌وپایِ بستەی من است!

## ( هەیٚک نیسنم )

دەیٚ نە کەسیٚ ترم

خود خوەمم!

❖❖

## ( وقتی کە می‌نویسم )

دیگر نە کسی دگر

خودِ خودم هستم!

## ( پەلەپەل )

شەتاو، ڤەپێل

ڤەرەو دەریا

ئەژ خوەیۚ، ڤەرەو خوەیۚ!

❖❖

## ( شتاب )

موجزنان، برفابْ رود

رو به دریا

از خود، به خود!

## ( مردن )

مردن دە زەلکاویش ڕەنگینە

ئەگەر فڕین

دما ڤیرمۆنەکەیۚ باڵنە بوو!

❖❖

## ( مرگ )

مرگِ در مُرداب هم زیباست

اگر پرواز

آخرین خاطرەی پرندە باشد!

## ( ڕەنگینترین سۆرەگوڵ، ئازادییە )

ژین، باخێکە و

باخەڤۆنەکەیٚ، ئەفتاو

"ئازادی"ـیش ڕەنگینترین سۆرەگوڵ باخەکەیٚ ئەفتاو!

❖❖

## ( زیباترین گُل‌سرخ، آزادی‌ست )

زندگی، باغی‌ست

باغبانش، خورشید

زیباترین گُل‌سرخِ باغِ خورشید، «آزادی»ست!

## ( کتاو چەم )

هەر پەشک، وشەیٚکە و

هەر وشە، دەسپێکیٚ و

کتاو چەم ڤە یەکم وشەیٚ ڤارۆ دەس ڤەیٚکەریٚ

❖❖

## ( کتابِ رود )

هر قطره، واژه‌ای و

هر واژه، آغازی و

کتابِ رود با نخستین واژه‌ی باران می‌شود آغاز

## ( هووار )

ئێمڕوو هەرچی بێدەنگییە

ئەژ نک قلەم ڕژیێ؛

دەفتەرەکەم سۊ

ڤێشەیێ هووارە!

❖❖

## ( فریاد )

امروز هرچه سکوت

از نُک قلم می‌ریزد؛

فرداست دفترم

بیشه‌ی فریادی!

## ( شنە )

نە باکوورییە و نە باشووری

نە ئەژ ڕووژهەڵات یەتێیە و نە ئەژ ڕووژئاڤا

شنەیێ ئێمڕوو، ئەژ لایێ شائرانەێک ئەڵکردێیە!

❖❖

( نسیم )

شمالی یا جنوبی نیست

نه از شرق آمده و نه از مغرب

نسیمِ امروز، از سمتی شاعرانه می‌وزد!

( زەیتوون )

"ئاپۆ"

هەرئەو پەل زەیتوون سەوز سەدەو

ک ئەژ کەمووترەل، ئەوشاردنەسەی

❖❖

( زیتون )

«آپو»

همان شاخه‌ی زیتونِ سبزِ قرن است

که از کبوتران، پنهانش نموده‌اند

## ( چریکەیێ بەرد )

فڕین بێباڵنەیێکە و

چەمێ ئەژ چریکەیێ بەردە:

"گەریلا"!

❖❖

## ( آوازِ سنگ )

پروازی بی‌پرندە و

رودی از آوازِ سنگ است:

«گریلا»!

## ( بەرف شائر )

دە ئی ڕووژ ڤهارییە، شائرێکە بەرف

دەنگ وشەلەیێ ئشنەڤم

ک ئەژ هێڵ دماین دەرڤەنەکە،

دچوو ڤەرەڤ زڵاڵیی ڤڵات چەم!

❖❖

## ( برفِ شاعر )

در این روز بهاری، شاعری‌ست برف

آوای کلماتش را می‌شنوم

که از خط پایانیِ درّه،

به زُلالایِ سرزمین رودخانه می‌رود!

## ( دووزەق )

ئێمە ڤە گووچنگ ئشق

ئەژ "نیل" ئی دووزەقە گواریمنە

❖❖

## ( دوزخ )

ما با عصایِ عشق

از «نیلِ» این دوزخ گذشته‌ایم

## ( ئەڵچەنن )

بایٚ ڤە سەرپەنجەل خوەیٚ

ئەژ ڕەنگ چنێکەم:

پایزەڕوو!

❖❖

## ( برچیدن )

با سرانگشتانِ خود، باد

مرا از رنگ می‌چیند:

روزِ پاییزی!

## ( تین و تاسە )

ئەگەر نەڤیا تین و تاسە

ئەریٚ قەڵڤەز دێیەتە دی؟!

❖❖

## ( شوق و عطش )

اگر شوق و عطش نبود

موج هرگز زاده می‌شد؟!

## ( ڤەرزێ ڤە ناو ژن! )

ڤەوڵاێ پەنجرە

زمسۆ، بەڤی ئسپێپووشەێ خەمبارێکە

ئەنووگرتە، دە بێدەنگیی هەنهەن لێڵەێ چارەنقیس.

ئۆ ڤەیلاێ بێئاسارەێ خوەشبەختی

ژن، ڤەرز پەنجم ساڵە!

پژارەدار

ڤارۆنی

❖❖

## ( فصلی به نامِ زن! )

در آن‌سویِ پنجره

زمستان، عروسِ سپیدپوشِ غمگینی‌ست

بُغض‌کرده، در سکوتِ گرگ‌ومیشِ سرنوشت.

و در این‌سویِ بی‌ستاره‌ی خوشبختی

زن، فصلِ پنجمِ سال است!

اندوه‌زده

بارانی

## ( باڵەڤگرتن )

ئەر کرم ئەڤرێشم

قانە بوو، ڤە نزمی و بێبایەخیی ئاخڵەێ پیلەکەێ

ئەرێ قەت پەیییێ باڵەڤگرێ؟!

❖❖

## ( پرواز )

اگر کِرم ابریشم

به پستی و حقارتِ چنبرِ پیله‌ی خود قانع شود

هرگز آیا پروانه‌ای پرواز خواهد کرد؟!

## ( گرەتینگی )

هەر ڕۆو، شۆ ڤەشۆن ڕووح سەوز کۆسار

ئەڵقورنێمن ڕزگێ ئەژ سەفەرنامەێ ڕووبار و

هاڵێ دەریاێک دە ئاسوو ڕەوەنە...

❖❖

## ( عطش )

هر روز، دوشادوش روحِ سبز کوهستان

سطری از سفرنامه‌ی رودخانه می‌نوشیم و

در افق جاری‌ست همچنان دریایی...

## ( لاڕێ )

هوورەیکە دڵ

ک نەشنەفتینەێ

بزۆ کەفتینە لاڕێ!

❖❖

## ( بیراهه )

دل، آوازی اهوراییِ‌ست

چو نشنیدی‌اش

بدان که بیراهه رفته‌ای!

## ( ئاوژەنی )

گڵاڵ،

ئاوژەنییە

... تا حەقیقەت دەریا

❖❖

## ( شناگری )

رود،

شناگری‌ست

... تا حقیقتِ دریا

## ( ڕەز گەردوون )

دە ناو ڕەز گەردوون

ئەڵ یەیٚ پەلارە ئەژ پەلارەل فرەیٚ مەڤیٚ

گلە ئەنگیرەکەیٚ کچکەیٚ زەمی!

❖❖

## ( تاکستانِ جهان )

در تاکستانِ جهان

بر خوشه‌ای از خوشه‌های فراوانِ یک درخت مَو

حبّه انگورِ کوچکِ زمین!

## ( مۆنگ )

هۆچ شوون پایٚ نەکەفتێیە

ئەڵی بەرف قورسە و

کردێیە ئەڤگەر دار بەلییەل، مۆنگ!

❖❖

## ( ماه )

هیچ ردّ پایی نیفتاده

بر این برفِ سنگین و

از درختانِ بلوط، بالا رفته ماه!

## ( ڕسکان )

گلەی دکرد زەمی:

"ئمساڵ، هۆچ ڤارۆ نەڤارییە و

باخەکە گردێ پلْمژکیایێە".

ڤەلێ دە ناو دڵ م، گوڵاڵە کوچکلەێ پشک کردۆیی!

❖❖

## ( رویش )

گلایه می‌کرد زمین:

«امسال، باران نباریده هیچ و

باغ یکسره پژمرده‌ست».

در دلِ من اما، لاله‌ی کوچکی شکُفته بود!

## ( سۆرەگوڵ زاگرۆسی )

ئەۆرەل سێ، کڵ دن و

دەس کردێیە چەمەر، ڤارۆ:

سۆرەگوڵ زاگرۆسییێ شەهید بییە

❖❖

( گُل‌سرخِ زاگرسی )

ابرهای سیاه هلهله‌کُنان و

باران به سماعِ سوگ مشغول:

در شهادتِ یک گُل‌سرخِ زاگرسی

( ئەڵپەڕکە )

ڤە بڵاچەیٚ ئەوٙر و

ئەڵپەڕکەیٚ ڤارۆ

چەپەیٚ گوڵ هێروو ئەڵسیا ئەژ خەو

❖❖

( رقص )

با آذرخشِ ابر و

رقصِ باران

دسته گُل خطمی ز خواب برخاست

## ( لاو )

لەفاو بهارە

ڤە سەرپەنجەیٚ پینەڤەسەیٚ

کەرێکەمە خەڤەر ئەژ خەو

❖❖

## ( سیلاب )

سیلابِ بهاری

با سرانگشتانِ پینەبستەاش

بیدارم می‌کند از خواب

## ( ستار )

لەفاو

ئەژ دیار ڤیرمۆنەل شەوەکی یەتویی

دەنگەدەنگیٚ ئەژەیٚ نییە ئێڤارە

❖❖

## ( آرامش )

سیلاب

از سرزمینِ خاطراتِ بامدادی آمده بود

تنگِ غروب، همهمه‌ای نیست از او

## ( کەڵمەس )

کەڵمەسەل

ڤە بێ‌دەنگ

تەماشایٚ گڵاڕێژۆ کەرن

❖❖

## ( گُل حسرت )

گُل‌های حسرت

در سکوت

به تماشای برگریزان نشسته‌اند

## ( کل بیین )

گوڵدەمەل بڵاڵێک

ڤەگەرد هاژەیٚ تاف دچن

ڤەرەو شەو

❖❖

## ( عبور )

شکوفه‌های بامدادیِ آلبالوی کوهی

در میان خروشِ آبشار

به سوی شب روانه‌اند

## ( ئامووژیاری )

**یەکم ئامووژیاری:**

**"نە" ڤتن ڕایٚ خوەت بنە**

❖❖

## ( اندرز )

**نخستین اندرز:**

**«نه» گفتن را به خود بیاموز**

## ( چیا )

**نشۆنەیٚ سەرکەفتنە**

**کڕیٚ ک ڤە دەوٚر سەر چیا کێشیانە**

**قازقولٚنگەل**

❖❖

## ( کوهستان )

**نشانه‌ی پیروزی‌ست**

**خطی که بر فرازِ سر کوهستان کشیده‌اند**

**دُرناها**

## ( نسار ۱ )

**ئەریٚ، ڕێی هۆچ گوڵەفتاویٚ نەکەفتێیە ئەڵ ئی نسارە؟!**

❖❖

## ( سایەسار ۱ )

**گذرِ هیچ آفتابگردانی آیا نیفتاده به این سایەسار؟!**

## ( نسار ۲ )

**چەن لیسک**

**مێیا ئەژ ئی بنارە ئەڵکێشن**

**تا ڕەنگ گوڵەفتاو بگری، نسار؟!**

❖❖

## ( سایەسار ۲ )

**چند پرتوِ نور**

**باید از این دامنەی کوە بَرکِشند**

**تا چون گُلِ آفتابگردان شَوی، ای همیشە سایەسار؟!**

## ( نەژناسیین )

ئەڵ ئەو لق دارە

شکووفەیٚ ئەرخەڤانییٚ دە بایٚ شەکیٚ

ناویٚ نەیٚزۆنم

❖❖

## ( نشناختن )

بر آن شاخه‌ی درخت

شکوفه‌ای ارغوانی در باد می‌جُنبد

نامش را نمی‌دانم

## ( دارسمنەک )

کاشکا دارسمنەک

ئەژ ناو دارەل

تەنیا سدارە ئەڵبژارتا!

❖❖

## ( دارکوب )

ای کاش دارکوب

از میان دار و درخت

تنها دارِ اعدام را برمی‌گزید!

## ( ساڵ جەنگ )

دە ساڵ جەنگ

ئەژ گرد گوڵەل فرەترە

گوڵ ئەسرین!

❖❖

## ( سالِ جنگ )

در سالِ جنگ

فراوان‌تر از تمام گُل‌هاست

شکوفه‌ی اشک!

## ( ئەڕازیایە )

دە پەنا بەردێ

گوڵ نەرگس، زڵفەل تەڕێ هشک کەرێ

ئەوەدمای بایەڕووە

❖❖

## ( آراسته )

در پناه سنگی

گُل نرگس، گیسوانِ خیس‌اش را خشک می‌کند

پس از توفان

## ( هنارەس )

هەێک ڤلات، لێزەکەن و لانەڤاز بی

هنارەس، هنایێ تفەنگە

❖❖

## ( فریادرس )

وقتی وطن، آوارەی بی‌آشیان شد

فریادرس، فریادِ تفنگ است

## ( منەیکەر )

ئاخ! سێپریسکەکە

تو ڤەڤ باڵ زەمدارتە ئازادی

م ڤە ئی ئازایمە، منەیکەر ئازادییم هاڵێ

❖❖

## ( جوینده )

آه! ای پرستو

تو با آن بالِ زخمی‌ات آزادی

من با این تنِ بی‌زخم، جویندەی آزادی‌ام هنوز

## ( باوڕ )

تێژتر ئەژ بگدەیٚ بایٚە

باوڕیٚ ک ئاشاردەو

دە دڵ تەلیٚ گیا

❖❖

## ( ایمان )

بُرّندەتر از دشنەی باد است

ایمانِ نهفته در دلِ

یک شاخەی باریکِ گیاه

## ( کوتپڕ )

ئێڤارە، تووژاڵ یەکم بەرف

نیشتێیە ئەڵ یاڵ

مۆنگەشەڤ کوتپڕیٚ!

❖❖

## ( ناگهان )

هنگام غروب، لایەی نازکِ نخستین برف

بر قلّه نشسته

مهتابی ناگهانی!

## ( دەمەخەنە )

ڤە گرێڤە دێیام ڤەدی

کردمە کارێ، ڤە دەمەخەنە بچم!

❖❖

## ( خندەرویی )

با گریە زادە می‌شوم

بادا کە با خندە رَوَم!

## ( سەفەر )

سەفەرێکە

ئەژ خوەت ڤەرەڤ خوەت:

ژین

❖❖

## ( سفر )

سفری‌ست

از خود بە خویش:

زندگی

## ( لێژی )

ئەرێ مردن، لێژییەکەێ ملەێ دماینە؟!

❖❖

## ( سرازیری )

آیا مرگ، سرازیریِ آخرین گردنه است؟!

## ( هووکارە )

ئەر هووکارەێ کەفتنی و

باڵ نەیگری

ئاسمۆ ئنکار نەکە!

❖❖

## ( خوگرفته )

گر خو گرفته‌ای به افتادن و

نمی‌پَری

آسمان را مکُن انکار!

## ( تەژگا )

تەژگاکەێ گەردوون

ڤە پریسکەێ ئشق و ئازادی

ئەوکریا

❖❖

## ( اُجاق )

اجاقِ عالَمِ هستی

با شرارەی عشق و آزادی

افروخته شد

## ( دەنگ )

دەنگ ڤەچکردن دار بەلییەل بەرزترە

یا کلّپەکلّپ پاییز؟!

❖❖

## ( آوا )

آوای جوانەزدنِ بلوطها بلندتر است

یا صدایِ شعلەهای پیاپیِ پاییز؟!

## ( دەرەقەت )

ڕچ ئشکنێ

ڤەچێ ئمێ

ڤەرەڤ ملەێ ئەفتاو

❖❖

## ( چیرگی )

از میان برف و یخ، رَه می‌گشاید

جوانه‌ای امید

رو به قلّه‌ی خورشید

## ( تۆمارزوو )

گلّپەێ گولّێ تۆمارزوو ڤاران

ئەژ ناو خولّەکوو دیرۆک:

کوردستان!

❖❖

## ( مشتاق )

لهیبِ آتشِ گُلی مشتاقِ باران

از میانِ خاکسترِ تاریخ:

کُردستان!

## ( گرفت )

ساوڵ هەر گرفتێ

داوڵێکە

ئەر پەلەڤەر دڵت، نم بفڕێ

❖❖

## ( مانع )

شبحِ هر مانعی

مترسکی‌ست

اگر پرنده‌ی دلت، در ارتفاعِ پَست پرواز کند

## ( خاک‌وخوڵ )

کوم ڕهێڵ

ئی خاک‌وخوڵە ماڵێ

تا چەوۆ دڵ بۆیینێ؟!

❖❖

## ( گرد و غبار )

کدامین رگبارِ باران

می‌روبد این گرد و غبار

تا چشمِ دل ببیند؟!

## ( بەرف کارەسات )

دە بەرف ئی کارەساتە، تەنیا یەکێ نوقم نەڤی و

ژیا

ئەڤیش "همێ"!

❖❖

## ( برفِ حادثه )

در برفِ این حادثه، تنها یکی غرقه نشد

و زنده ماند

آن‌هم «امید»!

## ( لەڤەخەنە )

ئاشتی

لەڤەخەنەیێکە

ئڵاتنێ دێرتر ئەژ گرد ئاسارەل

❖❖

## ( لبخند )

صلح

لبخندی‌ست

طلوع‌اش دیرتر از همه‌ی ستاره‌ها

## ( دەرچیین )

بەرزەهەوایله

هەیڤایە ئەژ دەس زاروو

رێڤارێ دە منەی ئازادی!

❖❖

## ( گریختن )

بادبادک

گریزان از دست کودک

رهگذری در جستجوی آزادی!

## ( ئەڤرەسیین )

"ئێمکە"ێ ئاونگێ

ئەڵ پەرەێ گوڵ هێرووێ

"هەیتاهەێ"ـە

❖❖

## ( ادراک )

«اکنونِ» شبنمی

بر گُلبرگِ یک خطمی

«تا ابد» است

## ( بۆچگڵانە چۆ... )

باڵدارێ کوچکڵە و

هووڵ ئاسمۆنێ پڕ ئەژ چنگڕ...

مەتەڵ "ئەڵبژاردنێ هەمیشەیی"!

❖❖

## ( کوچک مثلِ... )

پرنده‌ای کوچک و

هراسِ آسمانی پُر از چنگال...

داستانِ «انتخابی همیشگی»!

## ( ئەژ ڤیر دچێمن هەیچەڤە ک... )

پایزەپڵە

سڕی

ئەڤەێک ئەژ یایێ و ڤیر بڵاڵیکەیل مەنویی

❖❖

## ( از یاد می‌رویم همان‌گونه که... )

بارانِ پاییزی

سِتُرد

هرآنچه از خاطره‌ی آلبالوهای کوهی مانده بود

## ( شەڤەکی )

شەڤەکی

شەقەیٚ باڵ خەو

چی شاقەشاق کیەوگە

❖❖

## ( سپیدەدم )

سپیدەدم

صدای بالِ رؤیا

همچو آوای خواندنِ کبک است

## ( پرتووک گەردوون )

گەردوون، پرتووکێکە

ئنسان خۆنێکەیٚ

❖❖

## ( کتابِ جهان )

جهان، کتابی‌ست

انسان می‌خوانَدَش

## ( تا هناسێ هەس )

بژی

نە ڤە باڵەتەپە،

ڤە باڵگرتن!

❖❖

## ( تا نَفَسی هست )

زندگی کُن

نە با بال‌بال‌زدن،

بلکە با پرواز!

## ( سارێژ )

ئەژ زەم تین

تا سارێژ ئاو

تەنیا گرمەرێ مەنێیە

❖❖

## ( التیام )

از زخمِ عطش

تا التیامِ آب

تنها تُندری ماندەست

## ( قەناری )

دمایٚ گڵارێژۆن ئێڤارە

تەنیا، چریکەیٚ قەناریێیٚ مەن

ئەڵ چڵ دارە ژارەکە

❖❖

## ( قناری )

از پسِ خزانِ عصر

تنها، آوازِ یک قناری ماند

بر شاخەی درختِ بینوا

## ( دما بڵێزە )

دما بڵێزەیٚ شەم

نووا ـ سووار گوڵدەمە

ئەر ئمیٚ، پا ڤە گەز بیٚ

❖❖

## ( آخرین شعله )

آخرین شعلەی شمع

سرقافلەی صبحدَم است

شکیبایی کند اگر امید

## ( کەتن و باڵگرتن )

گڵگلێ "ئە" ڤتنێ بەسە، ئەڕا کەفتن

گڵگلیش یەێ "نە" بەسە، ئەڕا فڕین

❖❖

## ( سقوط و پرواز )

گاهی سقوط را کفایت می‌کند، گفتنِ «آری»

گاه هم یک «نَه»، کفایت می‌کند پرواز را

## ( پرتووک ژین )

ژین، پرتووکێکە

خوەت نیسنینەێ

❖❖

## ( کتابِ زندگی )

زندگی، کتابی‌ست

خود می‌نویسی‌اش

## ( هەسار )

ئەر زەمی هەسار باڵنەلە

ئێمداڵ ئاسمۆ کوورەو؟!

❖❖

## ( حصار )

اگر زمین، حصارِ پرندەهاست

پس آسمان کجاست؟!

## ( مەتەڵ ئەڤگلبیین بەردێک )

بەردێ ئەژ کەمەر گلوور بی و

پەپییێ هلەڤپلە فڕی

هامشووێ چی مەرگ و ژی!

❖❖

## ( قصّەی فروغلتیدن یک سنگ )

سنگی از فراز کوه غلتید و

پروانەای شتاب‌آلود پَرید

رفت و آمدی بەسانِ مرگ و زندگی!

## ( گڵئاوردن )

قاز کۆییەل

ڤێنەیْ لەۆەخەنەیْ

گڵئاوردن، ئەۆدما هناسەیْ سەردیْ

❖❖

## ( بازگشت )

دُرناها

همچو لبخندی

بازآمدند، از پسِ یک آهِ سرد

## ( دڵەچرچە )

تریفەیْ مۆنگ

چرچیْ خسە دڵ داووڵ!

❖❖

## ( دلهره )

پرتوِ ماه

ترسی به دلِ مترسک انداخت!

## ( نەمر )

نەمر، گیۆدارێکە

دە ڤڵات ئەڵبەس ژییێ

❖❖

## ( نامیرا )

نامیرا، جانداری‌ست

در سرزمینِ شعر می‌زید

## ( دژەژەهر )

ئەژ کەێ ڤەی لا

ئەڵبەس، دژەژەهر هناسەێ ئژدهاێ "تەنیایی"ـە؟!

❖❖

## ( پادزهر )

از چه هنگام بدین‌سو

شعر، پادزهرِ نَفَسِ اژدهای «تنهایی»ست؟!

## ( پەلەپیتکە )

کوڵ گرتێیە پەلەپیتکەیٚ ڤریایٚ هنام

تا نەوا چەکمە سێیا

پا بنیٚ ئەڵ سووسەنیٚ

❖❖

## ( ماشه )

ماشەی هشیارِ فریادم نشسته در کمین

تا مبادا چکمەسیاهِ بدشگون

پا نهد بر سوسنی

## ( م )

کەیٚ، دە کوو، ڤەر کێیەل "ڤیر فرە دیر"ـێکم؟

❖❖

## ( من )

کِی، کجا، برای چه کسانی «خاطرەی بسیار دور»ی هستم؟

## ( بنیانان )

مردن، بنیانان سرووێکه

چی کووچبار

ک بنیایٚ قازقولٚنگەله

❖❖

## ( سرآغاز )

مرگ، سرآغازِ سرودی‌ست

چونان کوچ

که آغازِ دُرناهاست

## ( ئازادی، ناو باڵندەێکه )

ئێگل، دەرڤەچیش دقییه بزەیٚ

ئەڵ دەموچەڤ گرژ ئی دیڤاره

ئاخ! تەنیا ئەگەر باڵنەیٚ "ئازادی" بچریکەنا...

❖❖

## ( آزادی، نام پرنده‌ای‌ست )

پس، پنجره هم لبخندی می‌شد

بر چهره‌ی عبوسِ این دیوار

آه! تنها اگر پرنده‌ی «آزادی» می‌خواند...

## ( ڕێکڵاش خاس )

**بژی و مەمر**

**ئەمان نە ڤە بژیمەمر ژێردەسی!**

❖❖

## ( شیوەی نیکو )

**زندگی کُن و نمیر**

**ولی نە با بخور و نمیرِ بُشقاب (فرودستی)!**

## ( چارەنڤیس )

**دەسەلم، گیایَ پەژارە**

**چەڤەلم، کەنیی خەم**

**ئێمکە دارسۆنێ سێیام.**

**ئەرێ! تەڤەرێ خوازم و**

**گواریایێن ئەژ ناو دڵ ئاێنە**

**تا ئبراهم چارەنڤیسەکەێ خوەم بووم.**

❖❖

## ( سرنوشت )

دستانم، گیاهِ اندوه

چشمانم، چشمه‌ی حسرت

اکنون جنگلی سیاهم.

آری! تبری می‌خواهم و

قلبِ آینه را پیمودن

تا ابراهیمِ سرنوشتِ خویش باشم.

## ( داڵک )

دڵنەرم و

بەردین؛

داڵکم کۆ!

❖❖

## ( مادر )

مهربان و

بَرکشیده از سنگ؛

مادرم کوه!

## ( ڕۆمان ئازادی )

ئازادی، کتاو ڕۆمانێکه

ئگەرد یەکتری نیسنێم و خۆنێمنەیۆ

❖❖

## ( رُمان آزادی )

آزادی، کتاب رُمانی‌ست

با همدیگر می‌نویسیم و می‌خوانیم‌اش

## ( بەرزەفڕ )

پەپییێکم

بەرزەفڕتر ئەژ ئەڵۆ

ناوم: "ئاوەخت"!

❖❖

## ( بُلندپرواز )

پروانه‌ای هستم

بُلندپروازتر از عقاب

نامم: «آرزو»!

## ( ئەڤین و ئازادی )

گەریلا، کوو ئەڵبەسێکە

ڤە ڕستەیلێ

چنیایێە ئەژ ئەڤین و ئازادی

❖❖

## ( عشق و آزادی )

مجموعه شعری‌ست، گریلا

با جمله‌هایی

بافته از عشق و آزادی

## ( پرتووک حەقیقەت )

نڤیسکار "حەقیقەت"

ئازادییە

خوەنەرەکەێ، دڵ

❖❖

## ( کتابِ حقیقت )

نویسندەی «حقیقت»

آزادی‌ست

خواننده‌اش، دل

## ( گیانسەختی )

**داڵک ڤەدی یەتن دووارەم و**

**هەلوورکم:**

**دار!**

❖❖

## ( سخت‌جانی )

**مادرِ تولّدِ دوباره و**

**گهواره‌ام:**

**دار (درخت)!**

## ( پەن )

**پەنێ تر:**

**تەنانەت دە ئاسمۆنیش**

**پەلەقاژە، فڕین نییە!**

❖❖

## ( درس عبرت )

**درس عبرتی دیگر:**

**حتی در آسمان هم**

**دست‌وپازدن، پرواز نیست!**

## ( فره گل )

فره گل

"بێسەر"، سەربەرز و

"سەردار"، سەرشوورە!

❖❖

## ( بسا )

بسا

که «بی‌سر»، سرافراز است و

«سردار»، سرافکنده!

## ( ڤاهوو )

گرد جا دامه پا

چی ڤەرز گومبییەی بایۆ؛

ڤە منەی خوەم و گرێۆ ستار گرتن

❖❖

## ( سُراغ )

همه‌جا را درنَوَردیدم

همچون فصلِ گمشده‌ی باد؛

در جستجویِ خویش و لحظه‌ای آرامش

## ( کەنیاو )

کەنیاوێکە ژین

دچوو... دچوو

تا نادیار چووڵ و بێیاز مەرگ

❖❖

## ( چشمه آب )

زندگی، چشمه آبی‌ست

می‌رود و می‌رود

تا ناپیدایِ دشتِ خالی و فراخِ مرگ

## ( خەنجەرەکەێ دەسەزێڤین )

م، تۆ، ئەڤی

خەنجەرەل دە خڵاف خەوبردەکەێ ژەنگار ڤەسە.

ئەما ملهورڕ، هۆچ دەربەن نییە

باکێ نییە!

من و تن و ئەڤی

بووێمنە خەنجەرە دەسە زێڤینە ئەڵکێشیاێەکەێ "ئێمە"

تا چوار ستین لەشێ ئیگلە بێیاێە لرە!

❖❖

## ( خنجرِ دسته‌نقره‌ای )

من، تو، او

خنجرهای خُفته در نیامِ گرفته زنگار.

دیکتاتور اما، کَکَش هم نمی‌گَزَد

انگار نه انگار!

من و تو و او

خنجر دسته نقره‌ی آخته‌ی «ما» شویم

تا چار ستونِ تن‌اش بلرزد این‌بار!

## ( بەڵگ سەوز ڤتەێک )

ئەژ ڤەدی یەتن ئاسارە ئەشم

ڤەر شەق مەزایۊ چەوەڕێ

ئەژ ڕاوهاتەکەێ ڕەوەن گڵاڵ و چەم ئەشم

ڤەر کەنییێ ک خەو دەریال ددی

مزگانا دم شنەبایێ دڵداری

ڤە پرچەل ئازیەتبار ڕەنگینێ

ئۊ ڤەر ڤڵاتەکەم کوردستان

ئەژ ئازادی ئەشم... ئازادی!

❖❖

## ( برگ سبزِ کلامی )

از تولّد ستاره گویم

شبِ عقیمِ انتظار را

از ماجرایِ جاریِ رود خبر دهم

چشمه‌ای که خواب می‌دید دریا را

مژده می‌دهم نسیمِ عشق را

به گیسوانِ سوگوارِ زیبایی

و برای وطنم کُردستان

از آزادی می‌گویم... آزادی!

